# نەخشەرێگای ئۆجەلان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد

**التأريخ** 20-05-2011

**نەخشەرێگای ئۆجەلان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد**

**پێشەکی**

ئەو هەڵسەنگاندنانەی ئێستا دەیکەم، لەکاتێکدایە کەلەتورکیا گفتوگۆی دیموکراتیەت فرواندەبن، و چارەسەری کێشەی کوردیش لەناوەخنی ئەو گفتوگۆیانەدا شوێن خۆی دەگرێت. لە ساڵی"2009" دا وەکو بەڕێز سەرۆك کۆمار عەبدوڵڵا گولیش دەڵێت؛ یان دەبێ چارەسەر ببێ، یان چارەسەر ببێت." لەئاستێکی وادا خاوەن گرنگیە، لەبەر ئەو بەرپرسیاریەتەیی کەدەکەوێتە سەرشانی منیش، ئەمە پێشکەش دەکەم. وەکوتر هەموو ئەو دەزگا سەرەکیانەی کەبە ئاسایشی دەوڵەتەوە خەریکن، لەبابەت خێرای چارەسەرکردندا ئەو هەڵوێستە دیارانەیان نیشاندەدەن، وەهەروەها ئەو هەڵسەنگاندنانەی لەرای گشتیدا سەبارەت بەکەسایەتی من دەکرێن و لەبەر هۆکاری بانگەوازیەکانیش ئەم پێشکەش کردنە هێشتا گرنگتربوو.

لەسەر هەمان بابەت لە سەرەتای ساڵانی"1990"دا بەڕێز تورگووت ئۆزال، هەروەها لەساڵی"1997" دا سەرۆك وەزیری ئەوکات بەڕێز نەجمەدین ئەربەکان داواکاری نوسراو و بە زارەکیان، هەروەها لەهەمانکاتدا ئەو پەیامە و زانیاریانەی کەلەبەشی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی سوپاوە دەهاتن، لەساڵی"1999"دا لەقۆناخی دەستگیرکردنمدا لەکاتی لێکۆلینەوەی دە رۆژیدا، و چاوپێکەوتنەکانی دوای قۆناخی لێکۆلینەوە کەلەگەڵ هەندێك لەبەرپرسیاران ئەنجامدرا، هەروەها ئەو نامانەی کەمن بەنوسراو ناردبووم بۆ هەندێك لەکاربەدەستان، هەروەها نووسین و هەڵسەنگاندنەکانیشم ئەوەندەی تر مەیلەکەم سەبارەت بەکۆمار شوێنی دیارتردەبێت، بۆیە بەکاریگەردەبێت.

بەشی یەکەم: دەستپێك

لەمێژوودا کێشەی دیموکراتی بوون بەردەوام هەبووە، وەکو ئەوەی زۆرجار دیاریدەکرێت لەگەڵ مۆدێرینیتەی ئەوروپاوە دەرنەکەوتووە. لەسروشتی کۆمەڵگاکاندا مەیلی دیموکراتی بەردەوام هەیە. لەناوەڕۆکدا دیموکراتی پەیوەستە بەو هەبوونەی دەربارەی خۆی و دەستپێشخەری و رووبەڕوو بوونەوەی پێکهاتەی بەڕێوەبەرایەتیەکەی. لەو باوەڕەدام ئەمە تێڕوانینێکی گەردوونیە.

لەمێژووی شارستانیەتدا بەتایبەتی لەقۆناخی سەرەتای سومەریەکاندا، دەزگای ئەنجومەن کە پێکهاتووە لەوتەبێژی کۆمەڵگای کشتوکاڵی و خەڵکی شار، رۆڵێکی گرنگیان گێڕاوە. ئەو دەزگا دیموکراتیانەی لەقۆناخی سەرەتادا دەبینرێن لەگریك ـ ئەسینا، لەشارەکانی سومەر بووە، ئەوەش راستیکە ناتوانرێت نکوڵی لێبکرێت. لەناو قۆناخەکەدا دوای ئەوەی فشاری راهیب، بەڕێوەبەرایەتی سیاسی و چەکداری لەناو بەڕێوەبەرایەتیدا زیادبووە، دەزگا دیموکراتیەکان کەوتنە پلانی دووەم و گرنگی خۆیان لەبەڕێوەبەرایەتیدا لەدەستدا. لەسەردەمی نەمرودو فیرعەوندا کە سەردەمی پادشا ـ خودایە، لەبەرئەوەی هەموو کەس وەکو" کۆیلە خولقێنراوە" بەو شێوەیە واتای پێدراوە، ئیدی لەوانەنییە مرۆڤ بتوانێت باسی دامودەزگای دیموکراتی بکات. ئەو قۆناخە لەهەموو شارستانیەتەکان گوزەراوە. لەقۆناخی سەرەتایدا دواترین نمونەمان لەئەزمونە دیموکراتیەکان و کۆماری ئەسینا و رۆمادا دەبینین.

لە چاخی ناویندا سەرەتای قۆناخی کریستیانیدا یاخود ئەو سەردەمەی هێشتا ئیمپراتۆریەتی بێزانتینی وەك ئاینی فەرمی خۆی قبووڵ نەدەکرد، لە ساڵەکانی سەرەتای ئیسلامدا، هەرچەندە هەندێك رەگەزی دیموکراتی گرنگیشیان هەبێت، نەریتی زاڵ ئیمپراتۆرە، خێرا کاریگەری ئەو رەگەزانە پاکتاودەکات و بە رێگای بەڕێوەبەرایەتی ناوەندی و تۆکمە، درێژە بە هەبوونی خۆیان دەدەن. لە کیشوەری ئەوروپادا ئەو دامەزراوە نوێیانەی شارەکان کە لە سەرەتای ساڵەکانی (1000)وە هاتوونەتە ئاراوە، بۆ ماوەیەکی درێژ بە نەریتی دیموکراتیەوە بەڕێوەچوون. ئەو شارانە ماوەیەکی درێژ لە بەرامبەر دەسەڵاتی دەرەبەگایەتیەوە، ناچار ماون دەزگا دیموکراتی و سەربەخۆکانیان بپارێزن. لە بەرامبەری رژێمەکانی پاشایەتی کە دەهاتنە ئاراوە، لە بەرخودانی میرەکان و کۆمەڵگا سەربەخۆکانی گوندەکان (چیایەکان)دا، رەگەزی دیموکراتی رۆڵێکی گرنگی گێڕاوە.

لە سەدەی (15) بەدواوە کە پاشایەتی وەردەچەرخێتە مۆنارشی رها، نەریتی شارستانییەتی دیموکراتی لە ئاستێکی گەورەدا لەدەرەوەی بازنەدا هێشترایەوە. بە تەنیا لە دوورگەی بەریتانیا (ماگنا چارتا) کە لە بەرامبەری پاشایەتی لە ساڵی (1216)دا بە فەرمی بەسەریدا سەپاندون، وەك نەریتێکی دیموکراتی هەبوونی خۆیان پاراستووە. شۆڕشی مەزنی فەڕەنسا لە ساڵی (1789)دا، لە بەرامبەری مۆنارشی رها، وێڕای ئەوەی وەك شۆڕشێکی گەل دەستی پێکرد، بە تێپەڕبوونی کات وەرچەرخایە دیکتاتۆری بورژوازی. ئەم دیکتاتۆریەتە وەك (دەوڵەت ـ نەتەوە) خۆی بەڕێکخستن کردو بە دەسەڵاتێکی سەروتر لە مۆنارشی رها خۆی رێکخستەوە. (دەوڵەت ـ نەتەوە) بچوك کان کەبە سیاسەتی جیاواز بەڕێوە بچن روویان لە زیادبوون کرد و بەمشێوەیە لە ئەوروپادا قەوارەیەکی هاوسەنگ هاتە ئاراوە. ئەو رژێمانەی بە شێوازی

(دەوڵەت ـ نەتەوە) بەڕێوەدەچوون، وێڕای هەموو خەیاڵە لیبراڵییەکانیان، خاوەن ئەو تایبەتمەندیانەی رژێمی ئۆلیگارشی بوون کە لەلایەن چینی سەردەست بەڕێوەدەچوو. دەزگاکانی ئەو کاتەی پەرلەمان، هیچ کاتێك نەیانتوانی سەردەستی چینی ئۆلیگارشی لەناوبەرن. بێگومان ئەو دەزگا دیموکراتیانەی کە لە سەر بنەمای تێکۆشانی درێژخایەنی خەڵکی شار و گوند دامەزراون، هیچ کاتێك بە تەواوەتی لەناو نەبراون. لەبەر ئەمەش ئەو دیموکراتانەی لە ئەورووپا تا ئەمڕۆ بوونیان هەیە، دیموکراتیەتێکی چینایەتییە کە لە ژێر کۆنترۆڵی بورژوازی ئۆلیگارشی و لە ناوەڕۆکی کۆمەڵگا دوورە. دوای ساڵەکانی (1950) وێڕای هەوڵدانەکانی یەکێتی ئەورووپا بۆ کۆنفیدراسیۆنی یەکێتی دیموکراتی کە (دەوڵەت ـ نەتەوە)ش تێدەپەڕێنێت، نەیتوانیوە یەکریزی ئۆلیگارشی (دەوڵەت ـ نەتەوە)کان بشکێنێت. ئەزموونەکە گرنگە، بەڵام چانسی سەرکەوتنی مسۆگەر نیە.

وەکو ئەوەی لە هەموو جیهاندا نمونەی بینراوە، ئیمپراتۆریەتی عوسمانیش لە سەر بنەمای شۆڕشی ئیندۆستراليزم (پیشەسازگەرایی) لە سەدەی (19) بەدواوە، کەوتە ژێر کاریگەری ئیمپراتۆریەتی بەریتانی و زلهێزەکانی ئەورووپا. ئیمپراتۆریەت کە لە سەر بنەمای نەریتی کۆنی دەوڵەتی رۆژهەڵاتی ناوین دامەزرا، لە بەرامبەر پێشکەوتنی خێرای چەمکی دەوڵەت ـ نەتەوە، بۆ ئەوەی لەناو نەچێت، ویستی خۆی لە سەر بناخەیەکی بیرۆکراتی سەرلەنوێ دامەزرێنێتەوە و خۆی بگۆڕێت بۆ دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی ناوەندی و تۆکمەتری عوسمانی. ئەو سەرهەڵدانانەی کە خۆرسك بوون ویستی بە توندی بیانچەوسێنێتەوە. لە ئەنجامدا پێکهاتەیەکی وەك کۆماری تورکیا لە ئەنادۆڵ و میزۆپۆتامیای ئەمڕۆ دامەزرا کە زۆرینەی لە نەتەوەکانی تورك و کورد و گەلێك پێکهاتەی ئەتنیکی تر پێکدێت، ئەمەش لە میراتی ئیمپراتۆریەت ماوەتەوە. لێرەدا رۆڵی بەرچاو ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا گێراویەتی. لە قۆناخی سەرەتای سەدەی بیستەم بەدواوە، بۆرژوازی تورك کە خۆی لە ناو دەوڵەتدا وەك پارتی ئیتیحاد و تەرەقی بەرێکخستن کرد و لە نەتەوە تێکەڵاوەکان پێکدێت، بە نەتەوەپەرستییەکی زۆر تۆکمەی سەرەتا لە سەردەمی مەشروتیەتی دووەمدا، دواتر لە رژێمی کۆماریدا بەرەو دیکتاتۆریەت رۆیشت. لە سەرەتادا مستەفا کەمال وێڕای ژمارەیەك سەرۆکی کاریزماتیکیش، دیکتاتۆریەتی ئۆلیگارشی لە ناو دەوڵەتدا تا ئەمڕۆ درێژەی بە هەبوونی خۆی دا. دادگایی ئەرگەنەکۆن بە نەریتی ئۆلیگارشی دیکتاتۆریەتی سەد ساڵەی ناو دەوڵەتدا پەیوەندی هەیە، وەك ئەنجام، ئێمە دەتوانین وەك دادگاییەکی گرنگ کە دەتوانێ چارەنووسی دیموکراتی دیاری بکات هەڵسەنگاندنی بۆ بکەین.

سەرەڕای ئەوەی دیموکراتی لە سەردەمی مەشروتیەت تەنانەت لە کاتی خۆ بەرێکخستن کردنیشەوە بابەتێکە گفتوگۆی لە سەر دەکرێت، بەڵام وەك چەمك و دەزگا پەرەی نەسەند. بەتایبەتی دیموکراتی دانەبەزاندە ئاستی "دیمۆ" یاخود گەل. زیاتر وەرچەرخاوە یارییەك لە نێوان دوو گرووپی هەڵبژێردراو کە پشتی بەدەرەوە دەبەست، یاری بە بەشی هەڵبژاردەی گوندان و بیرۆکراتی دەوڵەت کرا. لەڕاستیشدا هەر شتێك کە پەیوەندیدارە بە بەرژەوەندی خەڵك، لەلایەن ئەو هەر دوو گرووپەی ئۆلیگارشی هەڵبژاردەوە چەوسێنرانەوە و سەرکوت کران. سیستەم خۆی لە رێگای ئابووری، ئایدیۆلۆژی، سیاسی، سەربازی و کلتوری بەشێوەیەکی تۆکمە و داخراو دامەزراند و بەهێز کرد و تا ئەمڕۆ درێژەی بە هەبوونی خۆی دا. بەڵام کاتێك ژێرخانی کۆمەڵایەتی گەشەی دەکرد لەگەڵ تێکۆشانی جەماوەری، لە دامەزراندنی ئەم ژێرخاندا تا ئەمڕۆ، زیاتریش لە هەلومەرجی ئێستادا بناخەکەی لە راچڵەکاندنیدا دوانەکەوت. کێشەکانی دیموکراتیبوون بە پەیوەندی لەگەڵ ئەم پێشکەوتنانەوە پەرەیسەند. لەبەر کاراکتەری داخراوی ناوخۆیی دەسەڵات و مللیگەرایی، ئاینگەرایی، رەگەزگەرایەتی و زانستی پۆزیتیڤیست"زانستگەریەتی" و ئایدیۆلۆژیای تر، کێشەکان لە کایەی گفتوگۆشدا نەگەیشتە پێناسەیەکی راست. حقوق لە بوونی وەك یاسای دەوڵەت، زیاتر بەرەوپێشەوە نەچوو. هیچ کاتێك دەرفەت بۆ مافی تاکەکەس و گەل نەرەخسێنراوە. ئەو دەستورەش کە دانراوە، نەیتوانیوە خۆی لە ژێر کۆنترۆڵ و کودەتاکان رزگار بکات. نە ئازادییەکی شایستەی رادەربڕین، نە ئازادی رێکخستنبوون دانپێدانراوە. ئازادی رادەربڕین کە لە سەر بنەمای رێکەوتنێکی دیاری کۆمەڵایەتی نییە، لە بەر ئەم هۆکارە، نەیتوانی خۆی لە رووبەڕووبوونەوەی هەمیشەیی پاکتاوکاری رزگار بکات. کاتێك ئازادی رادەربڕین و رێکخستنبوونی بنەڕەتی دانپێدانەندرا، لەبەر ئەوە رێکەوتنی پێویستی کۆمەڵایەتی دروست نەبوو، دەستپێك گۆڕەپانی دیموکراتی چینەکان دەچەوسێندرێنەوە، بۆیە ئازادی رادەربڕین و رێکخستن بوونی کۆمەڵی ئایینی و گەلان لە ئاستی پێویستدا نەهاتوتە ئاراوە. لەم بابەتەدا داوای هەر مافێك کە دەکرێت، هەر هەنگاوێك کە دەنرێت یان هیچ کاتێك کردەوەیی نابێت، یاخود بە کودەتا یان یاسای ئاسنینی نووسراو و شەفاف، لە کرداردا دوور کراونەتەوە.

سەبارەت بە کورد و کوردستانیشەوە، یاسا پۆلاینە نووسراو و نەنوسراوەکان، بە توندترین شێوەیە بەڕێوەچووە. تۆکمەترین یاسا سەبارەت بە راستی کورد و کوردستان، بەشێوەیەکی بێ بەزەیانە بەڕێوەچووە. لەگەڵ سزادانی جەستەیی، بە بەرنامەی قووڵ و بەرفراوانی تواندنەوە سڕینەوە، سەبارەت بە کورد و کوردستان چی هەبێ، یان پاکتاو و قەدەخەکراوە، یاخود هەوڵدراوە لە ناو ئایدیۆلۆژیای فەرمیدا بتوێتەوە و لەناو بچێت. وەك چەندین گروپ کە لە بەرامبەر ئەم سیاسەت و یاسایەوە سەریان هەڵدا، لە ناو نەریتی چەپگەراییدا، کۆمەڵێك مرۆڤ کە خۆیان بە ناوی (PKK)وە دەناساند، ئەو بەرخۆدانەی وا لە ساڵەکانی (1970)وە دەستی پێکردووە، بە شێوەی قۆناخی جیاواز، لەگەڵ سەختی و بەخشینی قوربانی زۆر، گەیشتە ساڵی (2009). ئەم بەرخۆدانە بەو گۆڕانکاریانەی کە رێگای لە بەردەمیان کردۆتەوە، لە بەرۆژەڤکردنی کێشەکانی دیموکراتی و گەیاندنی تا ئاستی چارەسەری، رۆڵێکی گەورەی گێڕاوە.

لە ژێر ئەم هەلومەرجانەدا لەدەرەوە ئەمریکا و ئەورووپا ئیتر وەك رابردوو ئۆلیگارشی داناسەپێنن، خۆیان لێ دوور دەکەنەوە و لەبەر ئەو گۆڕانکارییانەی وا بەرژەوەندی ئەوان دەخاتە مەترسییەوە، بۆ چارەسەری دیموکراتی کراوەن. لە کەش و هەوای سیاسی تورکیا بۆ جاری یەکەمە چانسی چارەسەری دیموکراتی بەرەودەستێنێت. لەم چوارچێوەیەدا،

پێویستی دەستورێکی مەدەنی لە سەر بنەمای رێکەوتنێك کە هەموو بەشەکانی کۆمەڵگا گەرنتی بکات، ئازادی رادەربڕین و مافی رێکخستن بوونی دیموکراتی، ئەوا بەبێتە خاوەن گرنگییەکی دیارکەر. دەستورێك لە سەر بنەمای ئازادی و مافی تاك و هاوبەش"کۆلەکتیف" پێشبخرێت، ناوەڕۆکی دیموکراتی، کۆمەڵایەتی، عەلمانی و مافپەروەری کۆمار بەمانا راستەقینکە بەرێوەبچێت و بپارێزرێت.
لەم چوارچێوە دەستوورییەدا کێشەی کورد وەك کێشە کۆمەڵایەتییەکانی تر، دەکەوێتە سەر رێگەی چارەسەری. ئەو کۆمارەی کەجلی دەوڵەتی ـ نەتەوەیی تۆکمە سستدەکات، لە ئاکامی بەدەستخستنی مافی تاك و هاوبەشی کورد، واز لەدروستبوونی جیابوونەوە بهێلین، وەکو ستوونێك لە مێژوودا هەر کات رۆڵێکی رەگەزی دامەزرێنەری گێراوە ئەوە هێشتا تەندروستردەبێت، بەم جۆرە ئەوا بگاتە یەکگرتنێکی دیموکرات و راستەقینە و هەمیشەیی. لە سەر ئەم بنەمایە ئەو زامە قورسانەی کە تێدایە، لە زیانی گیانی و مادی کە کۆتایی نایەت لە فرمێسکی چاوان رزگاری دەبێت. بەم شێوەیە ئاسایشی وڵات و خەڵك، گەشەپێدان و خۆشحاڵی هەمیشەیی دەبێتەوە.
بەشی دووەم: رەهەندەکانی پرەنسیبی و زاراوەی و هزری
کاتێك ئێمە لەراستینەی تورکیادا بۆ دیموکراتیبوون و چارەسەری کێشەی کورد بەرەو پێناسەکردنێکی کراوەو هەندێك لەچەمکەکان و ئەو چارەسەریەی کەدەتوانرێت پێکبێ دەچین، پێویستی بە تێڕوانینێکی ریشەی و رەهەندە هزری و ئەو پێوانانەی کەپێوە پەیوەستبین هەیە. کێشەکە لەرۆژانەی و سەردەمێکدا هەتا پێکهاتەکانی پێویست دەکات زاراوەکانی سەردەمی گۆڕانکاری ئاشکرابین. ئەگەر شێوازەکانی چارەسەری رۆژانە و سەردەمەکە پێکهاتەکان نەخاتە ناوخۆی، گومان دەکرێت رێگا لەبەردەم دووبارە دروست بوونەوەی کێشەکان بکاتەوە. نمونە هەندێك کێشە دەتوانرێت بەرێگای بەرنامەی کار و یاساکانەوە چارەسەربین، بەڵام کێشە بنەڕەتیە دەستوریەکان بە بەرنامەی کارو یاسایان چارەسەر نابن. کێشە بنەڕەتیەکان بەسیستەمی دەستورەوە پەیوەستن و پێویستە لەم چوارچێوەیەدا چارەسەر بکرێن.

ێ ـ رەهەندە زاراوەیەکان
لەتورکیا لەرابردوویەکی نزیکدا لەبەر ناو لێنانیش هەندێك جار قەدەخەکاری روویداوە، کێشە لەئاستی زاراوەبوونیشدا دەتوانرا چەقبەستبێت. زاراوەی"کورد"یش پێش زۆرێکی تر لەزاراوەکانی ئەدەبیاتی چەپ قەدەخەکرا. هێشتاش مەترسی هەیە لە زاراوەی "کوردستان"، لایەنە فەرمیەکان لەبەکارهێنانی خۆیان دەدزنەوە. لەجیاتی ئەوەی راوەستە لەسەر پێشکەوتنی زانستی زاراوەی کوردستان وە بکرێت، ئەمەش لەچۆنایەتی خەڵکی هەرێمەکە سەرچاوەدەگرێت، یان ئەوەتا لەلایەن بەرێوەبەرەکانی سەلجوقی و عوسمانی بە"وڵاتی کوردان" زۆرجار بەکارهاتووە، دەتوانین لەوبارەیەوە زۆر شایەتحاڵ نیشانبدەین. لەدامەزراندنی کۆماردا زاراوەکانی وەك"نوێنەری کوردستان" ئەنجومەنی کوردستان"هەرێمی کوردستان" لەلایەن مستەفا کەمال پاشاوە خودی خۆی ئەمەی زۆربەکارهێناوە. لەسەردەمی نکۆڵیکردن و توانەوەدا"ئاسیمیلاسیۆنیست"دا، قەدەخەکردنی زاراوەکانی وەك کورد و کوردستان، بەو واتایە نایەت کەهەبوونەکەیان لەناوبەبردرێت. کاتێك بەرەو چارەسەرکردن دەچین، قەدەخەکردنی بەکارهێنانی کورد و کوردستان پرسەکە زیاتر بەرەو بێچارەی دەبات. وەکوتریش دەرکەوت وەکو ناو بەکارهێنانی بەشێوەیەکی هەڵە پەسند ناکرێت. سەرباری دادگایکردنی لایەنی پەیوەندیداریشەوە، بەڵام رتدەکرێتەوە.
بەشێوەیەکی ئاشکرا لەسەرووی زاراوەکاندا ئەگەر پێناسەبکرێت دیموکراتیزەبوون خودی خۆی دێت. دیموکراتیزەبوون لەتورکیا زۆر لەناوەڕۆکی خۆی دوورخراوەتەوە. لەهەڵسەنگەندنەکانمدا بەو واتایەی کەمن بەکاری دێنەم دیموکراتیەت بنەماکەی چینایەتی نییە. هەموو پێکهاتەکانی کۆمەڵگا دەگرێتەوە. مۆری هیچ چینێك یان توێژێك لەخۆی نادات. هەم کەمینە هەم زۆرینە، زمان، ئاین، ئەتنیك، نەتەوە جیاجیاکان بەهەر شێوەێك بن، دەتوانن گوزارشت لەهەمان مافی رێکخستنی و تاك و هاوبەش بکەن و لەبەرامبەر دەوڵەتیشدا مافەکانیان لەگرەنتیدابێت. تواندنەوەو بێ کاریگەرکردن نەدەوڵەت لەناو دیموکراتیداو نە دیموکراتیش لەناو دەوڵەتدا راست نییە. رۆڵ و ئەرکی هەردووکیشیان جیاوازە. هاوسەنگ کردنی یەکتری دەوڵەت و دیموکراتی یەکێکە لە پرسە ژیانیەکانی دیموکراتیبوون.
دوو زاراوەی کەگرنگیان هەیە و کاتێکیش بەرەو چارەسەری دەچین پێویستە روون بکرێنەوە، "کۆمار و دەوڵەت ـ نەتەوە"یە. هەر کۆمارێك " دەوڵەت ـ نەتەوە" نییە. نمونە کۆماری رۆما وایە. هەر دەوڵەت ـ نەتەوەیەکیش کە بەخۆی دەڵێت کۆماریشم، ناتوانێت ببێتە کۆمار. زاراوەی کۆمار پەیوەندیدارە بە دیموکراتیەوە، بەواتای ئەوە دێت ئەو توێژانەی کۆمەڵگا کە لەناو گەلەوە شوێن دەگرن، بێ ئەوەی لەقۆرخکاری کەمینەی سەردەستی ئۆلیگارشی بەئاڵێن دەتوانن گوزارە بەنوێنەر لەخۆیان بکەن لەبەرێوەبەرایەتیدا. دەوڵەت ـ نەتەوەش نمونەی هەرەکراوەی لە ئیتالیای فاشیست و ئەڵمانیای نازی و ژاپۆندا بینرا، خۆی پەیوەست دەکات بە دەوڵەت = میللەت. لەناو خۆیدا میللەت بەگرووپی بەرژەوەندیە هەمەڕەنگەکان بەماف و ئازادیەکانیانیەوە پەسندناکات. دەرفەت نادات ئەو گرووپانەی لەناو دەوڵەت و میللەتدان، ببنە خاوەن بەرژەوەندی ناکۆك و جیاواز. لەناوەڕۆکدا ئەمە دیکتاتۆریەتە. رووپۆشی دیموکراتیەتی شکلی ئەو ناوەڕۆکە ناگۆڕێت. لەبەر ئەوەش کاتێك لە تورکیا بەرەو چارەسەری دەچین، راست پێناسەکردن لەتێگەیشتنی زاراوەی کۆمار و دەوڵەت ـ نەتەوە گرنگە. نمونە دەتوانرێت کێشەی کورد لەناو کۆماردا چارەسەر بکرێت، بەڵام ناتوانێت لەناو دەوڵەت ـ نەتەوەدا کە بەواتای نکۆڵیکردن لەکۆمار دێت، ناتوانێت چارەسەربکرێت. روونکردنەوە زاراوەی "وڵاتی هاوبەش" و "میللەت" بۆ چارەسەری ژیانیە. ئەو گەلانەی لەکلتوری جیاواز هەمان جوگرافیا بۆ خۆیان وەکو وڵاتێکی

هاوبەش دیارکردوە زۆر ئاسایە، ئەمەش زۆرجار لەمێژوودا دێتەوە بەردەم مان. نمونە ئەو جوگرافیایەی جاران پێی دەگووترا ئەنادۆڵ و میزۆپۆتامیا ئەمڕۆ بەگشتی وەکو تورکیاو کوردستان بەناو دەکرێت، وڵاتی هاوبەشی زۆرێك لەگەلانە – تورك، کورد، ئەرمەن، ئاشوری، عەرەب، یەهوودی، کریستیان و رۆم و زۆرێك لەگرووپی تر کەبە رەچەڵەك قەفقاسن هەیە. تەنها کردنی وڵاتی تورك و کورد دادپەروەرو راست نییە، کاتێك سنوری تورکیا ئەو دەڤەرانە دەخاتە ناو خۆی بەو واتایە نایەت کەبەتەنها سەربە ئەتنیکی تورکە.
مرۆڤ دەتوانێت بۆ زاراوەی"وڵاتی هاوبەش"یش هەمان پێناسە بکەین. میللەت بەتەنها لە یەکە یەکەی هاوڵاتیان دروست نابێت؛ وەکوتر و ئەوەی زۆریش گرنگە، ئەو گەلانەی ئەو هاوڵاتیانە ئەندامیانن، تاکو پێویستە لە میللەتی میللەتان تێبگەن. ئەگەر بێت و لە"وڵاتی هاوبەش" رێکەوتن دروست ببێت، ئەو کات هەموو ئەو گەل و میللەتانەی کەلەناو ئەم زاراوەیەدانەو لەناو سنوری هەمان دەوڵەتدا دەژین، دەبنە میللەتی هەمان دەوڵەت. وەك چۆن ئێمە دەڵێین کۆماری تورکیا، پەرلەمانی گەورەی تورکیا، بێژەی میللەتەکانی تورکیا بۆ دیموکراتیبوون بەبێتە زاراوەی چارەسەری.
روونکردنەوەی زاراوەی"ناسنامە" ئەوا بۆ چارەسەری ببێتە پشتگیری. ناسنامە سەر بە هەریەك لە پێکهاتەکانی کۆمەڵگابێت ئاینی، میللی، ئەتنیکی، کلتوری، رەگەزی و ... هتد. کەگوزارە لە کۆمەڵگاکان دەکات. بەڵام ئەوەی گرنگە لەو بارەیەوە ئەویش ئایا ئێمە نزیکی لایەنی کراوەو نەرمی ناسنامە دەبین، یان لایەنی داخراو و توند؟. کراوەو نەرم بۆ چارەسەری دیموکراتی پشتگیریەکی زۆر گەورە پێکدێنێت. داخراوبوون و توندبوونیش کێشەکە زۆر سەخت دەکات. مرۆڤ دەتوانێت پەیوەندی دوو ڕەگی ناسنامە کەپێکەوە پێکدێن، وەکو دەوڵەمەندیەك سەیری بکات. ئەوەی گرنگە مرۆڤ تێبگات، بەکۆتێزێك ناسنامەیەك لەناو ئەوەی تردا بهێڵدرێت، ئەو نزیکبوونە زۆر جیاوازو ناکۆکە.
سەبارەت بەکێشە زاراوەکان تایبەتمەندی هەرەگرنگ، زاراوەکان وەك تابۆ لێنەکرێن، هەرکامێك لە راستیەکانی کۆمەڵگا بەشێوەیەك کەببێتە نرخی زاراوەیەکی تەنگ و خۆ بەزلزان، شۆڤینیست و کە راستی خۆی زۆر تێپەڕاندوە هیچ شتێك لە رەوشەکە ناگۆڕێت. نمونە هەندێك ناوی وەك وڵات، نەتەوە، ئاین زمان...هتد. کارەکتەرەکان دەگۆڕێن و"مجردن"ئەبستراکتن، وەکو بەهای دۆگماتیکی سەرەکی داسەپاندن، لەدژی رۆحی چارەسەری دیموکراتیە.

ب ـ رەهەندە تیۆری "هزری"یەکان

سەبارەت بەدیموکراتیبوون روونکردنەوەی هەندێك رەهەندی هزری پشتگیری بداتە چارەسەری. جیاوازی دروستکردن لەنێوان هزری دەوڵەت – نەتەوە و نەتەوەی دیموکراتی، رەگەزێکی هەرە سەرەکیە. دەوڵەت – نەتەوە هەژمونگەرایی هاوڵاتیبوونی یەك زمان، یەك ئەتنیك بەبنەما وەردەگرێت. وەکوتر هەمان هاوڵاتی بەهەمان باوەڕی فەرمیەوە پەیوەست دەکات و ناچاری دەکات هەمان عیبادەت جێبەجێ بکات. ئەو باوەڕیەی باسی دەکرێت وڵاتپارێزی نییە. رەگەزپەرستی شۆڤێنی و ئاینگەراییە. دەوڵەت – نەتەوە لەناو پەیوەندی و ناکۆکیەکانیدا جیاوازیەکانی کۆمەڵگا پەسندناکات. یەکڕەنگی لەگەڵ هەمان گرووپەکانی تریش بەبنەما دەگرێت. ئەوە ئاشکرایە کەهزری نەتەوەیی بەگوێرەی ئایدیۆلۆژیای فاشیستە.
هزری نەتەوەیی دیموکراتی زۆر جیاوازە. خاوەن پێناسەیەکی نەتەوەیی فرە زمان، ئاین، نەتەوە، کلتور، گرووپە بەرژەوەندە جیاوازەکانە و تاکەکانی پێك دێت. تەنها یەك رەنگی هاوڵاتیان بەبنەما ناگرێت. پێناسەی "دەوڵەت ـ نەتەوە" پەسند ناکات. باوەڕی وایە کە هەردووکیان لەدوو پێکهاتەی جیاوازەوە پێکدێن. دەوڵەت و دیموکراتی دوو گۆڕەپانی جیاوازن کە پێویست دەکات بەهەستیاری لەسەری بوەستێنردرێت. ئەوەی گرنگە پێویستە هەردوو گۆڕەپان رەوا بوونی یەکتری بناسن، لەناو هاوسەنگیدا هەبوونی خۆیان بەدەستبخەن و بیکەنە حوکمی بنەڕەتی لەدەستوردا. هزری دیموکراتی بەقەد هاوڵاتی، جەماعەت، گرووپ و کۆمەڵگای مەدەنی بەگرنگیان دژمێرێت، هەمانکات هەبوونیان دەگەێنێتە گرنتی دەستوری. وەها بیر دەکاتەوە کە زاراوەی هاوڵاتیبوونی "مجرد، ئەبستراکت" زیاتر چەمکی لیبراڵەکانە، هاوڵاتیبوون بەتەنها ئەندامیەتی گرووپ، جەماعەت یان کۆمەڵگای مەدەنی نییە، بەڵکو پێویستە زیاتر واتایەکی"بەرچاو یان کۆنکریتی" بەدەستبخات.
کێشەیەکی هزری گرنگتریش سەبارەت بەدەستورە. ئەو پرسەی" ئایا دەوڵەت یان تاك بەبنەما بگیردرێت"؟ کەلە بنچینەی دەستوردا بەجێبووە، رەگەزێکە زۆر گفتوگۆی دەربارەکراوە. جیاوازی زۆرە لەنێوان هزری دەستوری کە وەکو یەکگرتنی یاساکانە کە دەوڵەتی پێ هەموار دەکات، لەگەڵ هزری دەستوور کەماف و ئازادیەکانی تاك لەبەرامبەر دەوڵەتدا پێ هەمواردەکرێت. هەمان مەسەلە بۆ ماف و ئازادیە هاوبەشەکان"کۆلەکتیف"ەکانیش تێپەڕدەبێت. لەهزری دیموکراتیبوون و هزری دەستوردا ئەوەی پێویستە بەبنچینە وەربگیردرێت، خۆی پەیوەست دەکات بە تێگەیشتن لەماف و ئازادیە تاك و گشتیەکان و پاراستنی لەبەرامبەر دەوڵەتدا. دەوڵەت وەکو دەسەڵاتێکی لەئاستی هەر ژووردا خۆی بەڕێکخستن کردوە، پێویستی بەخۆ پاراستن نییە. خۆی لەخۆیدا هەبوونی گوزارەیە لەپاراستنەکەی. خۆبەڕێوەبردن پەیوەست کردن بەیاسا بنچینیەکان، پێچەوانەی هزری دەستوری دیموکراتی نییە.
رەگەزێکی تر کەپێویست دەکات لەلایەن هزری دیموکراتیەوە باش بزانرێت، ئەویش جیاوازی لەنێوان هزری چارەسەری دەوڵەتگەرا و دیموکراتیە سەبارەت بەکێشە کۆمەڵایەتیەکان. هزری دەوڵەتگەرا چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتیەکان، لە بەدەوڵەت کردنی هەر شتێکەوە دەبینێت. نمونە بابەتێکی وەك ئاین کەپەیوەندیدارە بە فەلسەفەی میتافیزیك و باوەڕیەوەش بە دەوڵەوتی دەکات" دەیکاتە موڵکی دەوڵەت"، لەچارەسەرکردنی زیاتر دەبێتە کێشە. وەکوتر لەگشتی کێشەکانی وەکو ئابووری، کۆمەڵایەتی، کلتوری، نەتەوەیی بەدەوڵەت دەکرێن یان وایان لێ دەکرێت دەخرێنە

ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتەوە بەبۆنەی چارەسەرکردنیانەوە. ئاشکرایە کە ئەو هزرە چارەسەری پێ ناکرێت، کێشەکان هێشتا گرانترو زیاتریان دەکات. هەرچەند ئەو یەکێتیە کۆمەڵایەتیانە خۆیان بگێنە ئاستی گوزارەکردنی ئازادو رێکخستوو، ئەوەندەش بانگێشە دەکات کە رێگا لەبەردەم چارەسەربوونی خۆیدا دەکاتەوە. هزری دەوڵەتگەرا بەردەوام یاسایان لەسەر ئەو پێکهاتە کۆمەڵاتیە پەیوەندیدارانە دادەسەپێنێت، هزری دیموکراتی دەڵێت کۆمەڵگای پەیوەندیدار دەستپێشخەری خودی خۆی گرنگە و خاوەن مافیشە لەدیاریکردن و ئاواکردنیدا. پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەت بەتەواوی رتکردنەوە یان پێچەوانە ئەوا ئەو دەستنیشانی ناکات. هەرچەندە لەناو پەیوەندی و ناکۆکیەکان ئاڵۆزیش هەبێت، لەناو رێکەوتن و ئاشتیدا پێکەوە ژیان بەرەو پێشەوە دەبن. لەو چوارچێوەیەدا چارەسەری دیموکراتی بەئاشتیشەوە پەیوەستە. هەر ئاشتیەك کەدروست دەبێت لەوانەیە لەچوارچێوەی چارەسەری دیموکراتیدا نەبێت، بەڵام هەر چارەسەریەکی دیموکراتی راستینەی پێشکەوتن یان هەر هەبوونێکی کە ئێمە باسی لێ وە دەکەین"ئاشتیەکی ئابرۆمەندانە" گرەنتی دەکات. ئاشتێکی ئابرۆمەندانە بەناسینی هەبوون و مافی پێشکەوتنی ئەو هێزانەی کەئاشتی دەکەن پێشدەکەوێت.

مەترسێکی تری هزری دەوڵەتگەراش، ئەو هێزانەی لەبەرامبەر خۆشی کەبە کێشەکەوە کاریگەربوونە بەرەو دەوڵەتگەرایەوە ئاراستەیان دەکات، یان وەکو تاکە رێگای چارەسەری دەخاتە ناو مەترسیەك کە دەوڵەت ـ نەتەوە خۆی بسەپێنێت. بەواتایەکیتر بەرەو زهنیەتی لەبەرامبەر دەوڵەت، دەوڵەت پێشدەکەوێت. چانسی زۆری چارەسەری هزری دیموکراتی، جیابوونەوە نییە لەسنوری دەوڵەت، نە چوونیشە بەرەو دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی تر، پێویست و ناچاری دەبینێت. ئەوەی دەوڵەت نییە، دەوڵەتیش بۆ خۆی بەئامانج ناگرێت، رتکردنەوەو نکۆڵیکاریش ناکات، چارەسەریەکی نەرم پێشبینی دەکات، چانسی مەزن لەدەست هزری دیموکراتیدایە.

کێشەیەکی هزری ریشەی تریش، دەربارەی هزری تاك و هاوبەش"کۆلەکتیف"دایە. لەو بارەیەوە گێرەشێوێنیەکی زۆر هەیە یان پێشخراوە. ئەوە بابەتێکە کە تێگەیشتن لەتاکڕەویەتی لیبڕاڵیشی لەڕێگا دەرخستووە. تێگەیشتنێك لەئاستی هەرە خوارەوەی زانستی کۆمەڵناسی ئەوە نیشاندەدات کە تاك لەگەڵ کۆمەڵگا دایەو کۆمەڵگاش لەگەڵ تاك دایە، یەکێك ئەوەی تر لەناو خۆیدا هەڵدەگرێت یان ئەوەتا وەکو ئێمە دەمانەوێت واتای پێدەدرێت. بەبێ هەبوونی کۆمەڵگا تاکیش هیچ کات ناتوانێت بژی، ئاوەها تێبگەین کە ئێمە ئەگەر مرۆڤێك هەفتەیێك لەشوێنێك دابنێین ناتوانێت بژی. وەکو تر کۆمەڵگا بەهەوڵدان و پەیوەندیەکانی تاکەوە ئاوادەبێت. ئەمەش بەتێگەیشتنێکی بەهەستیار کەپێویست ناکات ببنە فەیلەسوف، بەئاسانی دەتوانن تێبگەن. سەختگیرکردنی کێشەکان سەرچاوەی خۆشی لە، ئافراندنی نەتەوەو هاوڵاتیەکی یەکڕەنگ، رتکردنەوەی مافی گرووپ، جەماعەت و کۆمەڵگای مەدەنی لیبڕالیزمەوە دەگرێت. ئازادی و مافی ئەو کۆلەکەتیفانە"هاوبەشانە" چەندەی کەمبکرێتەوە، چانسی داگیرکەری و دەسەڵاتداریەتی سەرمایەداری قۆرخکاری دەوڵەت ـ نەتەوە لەئاستی هەرە بڵندا زیاد دەبێت. ئەگەر باسی مافی تاك دەکرێت، بەڵام ناکرێت باسی مافە هاوبەشەکان بکەیت، رتکردنەوەی مافە هاوبەشەکان زیاتریش بەرەو پێشەو بچێت پەیوەستە بەنزیکایەتی فاشستیانەوە. هەتا ئەو کاتەی ماف و ئازادی بۆ کۆلەکتیڤایەتی "هاوبەشبوون" کە تاکیش ئەندامیەتی نەناسرێت، ناسینی ماف و ئازادی تاك هیچ نرخێکی نییە. وەکوتر ئەمە لەلایەنی هزریشەوە راست نییە. لێرەدا بەتەواوی یاری "عەلی جەنگیز" دەکرێت. دەڵێت" تۆ دەتوانی وەك تاك ئیسلام بژیت، بەڵام ناتوانیت وەك کۆمەڵگا بژیت" هەم دیماگۆژیەتێکی فاشیستانەیە، هەمانکات فێڵبازیە، بەدەستێك بیدەرێ و بەدەستێکیش وەری بگرەوەیە. ماف و ئازادیە تاك و هاوبەشەکان وەکو گۆشت و نینۆك یەکتری تەواو دەکەن. بێگومان لەم بابەتدا هەرجۆرە جەماعەتپەرستی و هاوبەشپەرستیەتی کە نکۆڵی لەتاك بکا و هەرجۆرە تاکڕەویەتیەکیش کە هاوبەشبوون رتبکاتەوە، پرەنسیبی هەرە بنچینەی هزری ماف و ئازادیەکانی تاك و هاوبەشن.

کاتێك لە چارەسەرکردنی کێشەی دیموکراتیزەکردندا پرەنسیبی هزری پێشدەخسترێت، پێویستە باشیش تێبگەین کە کێشەیەکی هەرە گرنگیش، زانستی کۆمەڵناسی پۆزیتیڤیستە" هەموو دیاردو رووداوەکان تەنها بەزانست بینینە" کە ناوەندەکەی ئەوروپایە بەتایبەت فەڕەنسا وەردەگرێت. لەگەڵ ئەوەی ئەزموونی کۆماری پێنجەمیش ژیاوە، هەم لەبەر هۆکاری عەلمانیەت، هاوڵاتی و جەماعەتپەرستیەتی فەرەنسا کە کێشەیان هەیە، هەمانکات لەبەرامبەر ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا لەدەرەوەو لەهەموو جیهانیش بانگێشەی سەردەستی لەدەستدا، بەشێکی هەرە بەرچاویش لە زانستی کۆمەڵناسی پۆزیفیستدایە. لەبەر ئەوەی کۆماری تورکیا پێش ئەوەش ئەزموونی تەنزیمات و هەردوو مەشرووتیەتان، لەراستیدا بۆ خۆیان سەرچاوەکەیان لە ئەزموونی کۆماری سێیەمینی فەرەنساوە وەرگرت، وەکوتر وەکو ئایدیۆلۆژیا مۆدێرنیتەی پۆزیتیفیزمی پەسندکرد، بەشی ئەمەش لەکێشە کۆمەڵایەتیەکاندا کەمڕۆ دەگوزەرێن لێکۆلینەوەکان ئەنجامەکانیان روونکردوە، ئەمەش زۆر گرنگە. زۆر روونە ئەگەر کۆمار لەماوەی "90"ساڵدا لەلایەنی دیموکراتیدا هەنگاوەکانی بەخێرای رۆیشتنی کیسەڵ پێکنەهێنابێت، هەتاکو کاریگەریەکانی پراکتیکی ئەزموونی تیۆری پۆزەتیڤیزمی فەرەنساو کۆمارگەرایەکەی دەرنەخەنە روو، دیسانیش زەحمەتەبێت چارەسەری سەرکەوتوو پێشبکەوێت، کێشە کۆنەکان بەردەوام دەبن. من باسی رتکردنەوەی هەموو کاریگەریەکانی ئەزموونی پۆزیتیڤیزمی فەرەنسا و کۆمارگەرایی ناکەم. بەڵام ئەگەر ئێمە لەشۆڕشە زانستیەکانی دوای ساڵانی"1950" پێشکەوتنە مەزنەکان کەلە هزری دیموکراتیدا دروستبوونە سوود وەرنەگرین و کاریگەریە خراپەکانی تێنەپەڕێنین، ئێمە ناتوانین چانسی دیموکراتی بوونی مەزن و ئازادی رامان باش بەکاربێنین. کاریگەریەکانی فەرەنسا لەلایەنی تیۆری و پراکتیکیدا، بۆ رۆژی ئەمڕۆشمان گرنگیەکی مەزنی هەیە و پێویستە شیکار بکرێت. بەگشتیش دەزانرێت زانستی کۆمەڵناسی کە ناوەندەکەی ئەوروپایە لە رۆژی ئەمڕۆدا بەفرەوانی رەخنە دەکرێت. رووپۆشی رۆهەڵاتناسی سەبارەت بە رۆژهەڵاتی ناوین تا دەچێت زیاتر ئاشکرا دەبێت. بەکورتی دەمەوێت بڵێم؛ ئەو بەها کلتوریانەی رۆژهەڵاتی ناوین کەلەماوەی "15000" هەزار ساڵدا هەتا رۆژی ئەمڕۆ

سەلمێنراون، بەتایبەتیش ئەو بەها کلتوریانەی ماوەی "5000" هەزار ساڵی دوای کە بۆ شارستانیەتی ناوەندگەرا سەرەکی بوونە، ئەگەر دەرفەتەکانی چارەسەری لەناویدا نکۆڵی لێ بکەین، زۆرێکیش لەوانە لەکلتوری رۆژهەڵاتی ناویندا دزراون، ئێمە باوەڕناکەین کە بە کلتوری ئەوروپای کەبە نزیك بوونە پۆزەتیڤیستی مادگەرایی قەبەی "500" ساڵی دوایی، ئێمە ناتوانین بۆ کێشەکانمان، کێشە سەرەکیەکانی کۆمەڵگا واتای پێبدەین و کێشەکانمانی پێ چارەسەربکەین. ئەو چارەسەریانەی کە ئەو کلتورە بەبنەمای وەرگرێت و جێبەجێبکرێن، زیاتر رێگا لەبەردەم پێکهاتەی نەخۆش بکاتەوە. ئەوەی راستە ئەویش رزگاربوونە لەهەژمونگەرایی ئایدیۆلۆژی کەناوەندەکەی ئەوروپایە، ئەو بەها مرۆڤایەتیە شکۆدارانەی کەلەسەر دابوونەریتی رۆژهەڵاتی ناوین و ئەوانەی تری رۆژهەڵات و نزیکبوونە چارەسەرئامێزەکانیان بۆ کێشەکان و بەرۆژەڤکردنیەتی. ئەگەر باسی تورکیا یان مۆدێلێکی چارەسەری رۆژهەڵاتی ناوین بکرێت، زۆر ئاشکرایە کەبەتەنها دەبێت ئەو مۆدێلە سەرچاوەی خۆی لەو راستیە مێژووی و کۆمەڵایەتیە شکۆدارەوە وەربگرێت.

یەکێك لە ئەنجامە هەرە گرنگەکانی فەلسەفەی پۆزیتیڤیستیش، وەکو بانگهێشی بۆ دەکات پێچەوانەیە، بەتایبەت رێگا لەبەردەم دۆگماتیزمێکی توند دەکاتەوە. لەژێر ناوی زانستدا دۆگماتیزمی مۆدێرینیزمی رەوا کردوە، رێگا لەبەردەم فاناتیزم"دەمارگیری"یەکی باوەڕی لەئاین توندتر کردۆتەوە. نمونە ئەو واتایانەی کە لە زاراوەکانی وەکو نەتەوە، وڵات، دەوڵەت، چین و کۆمەڵگاو...هتد، ئەو واتایەی دەدرێتە زاراوەکان لەو مانایی دەدرێت بەخودا هێشتا زیاتر یەکلاکرەوەترە. ئەمە دێتە ئەو مانایەی کە ئەم دەستەواژەیە، ئەو زاراوەنەن لەخودا مانادارتر دەبینرێن. سۆبژکتفیزم لە ئۆبژکتفیزم هێشتا بەشێوەیەکی مەترسیدارتر بەرەو دۆگماتیزمدا دەکرێتەوە. راستینەی شەڕ لە"500" ساڵی دوایدا لەجیهان و لەجیهانی رۆژی ئەمرۆماندا کە لەگەڵێك لایەنەوە گەیشتۆتە سنوری ئیتر بەردەوام نابێت، ئەمەش لەنزیکەوە پەیوەندیدارە بەماتریالیزمی پۆزیتیڤیستەوە.

کاتێك ئێمە دەڵێن لەدۆگماتیزمی سۆبژێکت رزگار ببین، ئێمە دۆگماتیزمی ئۆبژێکت هەڵنابژێرین. پێویستە بۆ ئێمە شتی سەرەکی رزگاربوونبێت لە هەژمونگەرای ئایدیۆلۆژیای رۆژئاوا. بەتەنها ئەوکات ئێمە دەتوانین کێشەکانی کۆمەڵگا و لەوانەش ئەوەی هەرەگرنگ دیموکراتیبوون، دەتوانین بەگوێرەی داواکاری کۆمەڵگاکەمان بیکەینە رۆژەڤ. دیموکراتیبوونی هەمیشەیی، لەناو ئازادی راماندا بەتەواوی کاتێك بەگوێرەی سروشتی کۆمەڵگا بەخۆی بووە جێگای گفتوگۆ، دەتوانێت چارەسەری بدۆزێتەوە. بەو زاراوەو هزرە سۆسیۆلۆژیانەی کە ناوەندەکەیان لەئەوروپایە، لەسەرووی هەموویان کلتوری ئیسلام، ئەو میراسە کلتوریەی کەهەندێك ئاست دەسازێنێت، رۆژانەناکرێتەوەو شیکاری بۆ ناکرێت. کردارەکانی ئۆریانتالیست" رۆژهەڵاتناسی" "200" ساڵی رابردوو، ئەو راستیەی لەئاستێکدا کەبەشدەکات سەلماندویەتی. بەتەنها رێکنەکەوتنی "عەرەب ـ ئیسرائیل" بەناچاری چۆن ژیان دەکەن وەکو نیشانیدەدەن، زاراوەی عەرەب ئیسرائیل"زاراوەی نەتەوەی پۆزەتیڤیستە" وەکو نمونە هەر یەك لەوانە بەتەنها کێشە دروست دەکەن ئەمە سەلمێنراوە، مرۆڤ دەتوانێت دیاری بکات. تۆ هەرچەندە بێیت واتا بدەیتە عەرەب ـ ئیسرائیل، تۆ ئەوەندەی تر کێشە دێنیە ئاستێك کەنەتوانن لەناوی دەربچن. لەبەر ئەوەی هەم زاراوەی عەرەب هەم ئیسرائیلیش، ئەو راستیەی باسی لێوەدەکرێت ناتوانێت بیژێنێت، گوزارشت لە حقیقەتەکە ناکات.

ئێمە دەتوانین بەهەمان شێوە بۆ جێبەجێکردنی دەستەواژەی تورك و کوردیش پێشنیارێکی بەم رەنگەبکەین، هەرچەند لەسەر تورك و کوردیش راستی بسەپێنرێن، لە رەوشێکی وا رێگا لەبەردەم سەخت بوونی کێشەکان دەکاتەوە کەلەچوارچێوەی ئەم زاراوانەدا دروست دەبن. راستینەی دەستەواژەی کورد و تورك زیاتر لەو سەد ساڵەی دوایی راستینەیەکی لاوازی بەدەستخستووە، کاتێك پێویستە لاوازبکرێت، بەڵام پێچەوانەی ئەمە کاتێك تاکو ئاستی حەقیقەتی میللەتێکی لەخۆی زیاتر گەورە دەکرێت، رێگا دەکاتەوە لەبەردەم جۆرێك لەو کێشانەی کە مرۆڤ ناتوانێت لەناویاندا دەربکەوێت. نەتەوەپەرستی کە وەکو ئاینی پۆزیتیڤیستە، کێشەکانی کۆمەڵگا لەئاینە کۆنەکان زیاتر ئاڵۆزدەکات. بەکورتی هزری چارەسەری ئەوەندەی توانی لە دۆگماتیزمی سۆبژە و ئۆبژە رزگاری ببێت، ئەوەندە دەتوانێت پشتگیری چارەسەری بکات.

بابەتێکی تریش کە پێویستە لەچوارچێوەی هزریدا بەدەست بگیردرێت، پەیوەندی رۆژانەی لەنێوان مێژوویبوون و "ئێستای"دایە. دۆگماتیزمی سۆبژە کەسەرچاوەکەی لە لەپۆزەتیڤیزمەوە دەگرێت، کاریگەریەکی زۆر لەسەر واتای نێوان مێژووی و ئێستای بووندا دیاریدەکات. یان ئەوەتا"ئێستا" وەکو هێزێکی دەتەرمینیستی"قەدەرگەرایی" توند پەسند دەکات، یان ئەوەتا مێژوو بەرەو هێزێکی قەدەرگەرایی کەبەرەو کاتی رابردوو دەچێت دەپێویت. لەڕاستیدا دێتە ئەو واتایەی کە لە نێوان مێژوو و ئێستادا هیچ جیاوازیەك نەدۆزیونەتەوە. لەبەر ئەوەشە نکۆڵی لە مێژوو دەکرێت. وتەی " ئێستا چیبێت مێژووش ئەوەیە" لەگەڵ خۆیدا رێگا لەبەردەم تێپەڵێك لە چەوتی و هەڵەی زۆر خراپ دەکاتەوە. دروستکردنی پۆزەتیڤیستی "ئێستای" بەشێوەیەکی وایە کە"90%"ی لەسەر نکۆڵی کردنە لە حقیقەت. رەنگدانەوەی مێژوو لەئاستی هەرە ژووردا رێگا لە نکۆڵیکردن یان پێچەوانە بەرەو زێدەگووتن دەچێت.

لەڕاستیدا مێژوو چۆن مەرجەکانی ئێستا دروست دەکات، بەلێکۆلینەوەیەکی وورد دیاریانکردوە. هیچ کێشەیەکی کۆمەڵگا دابڕاو لەمێژوو یان پێچەوانەی بەدەستناگیردرێت و چارەسەرنابێت. ناتوانین باسی ئێستایەك بکەین کە رەنگدانەوەی مێژووەکەی نەبێت. چەندی ئێستا لەمێژوودا گەڕان رێبازێکی راست بێت، کەمێکیش مێژوو لەئەمرۆدا گەڕان رێبازێکی بەدواداچوونی راستە. بەڵام لەمەدا ئەنجامی"مێژوو = بەئێستا" دەرناکەوێت. لەنێوانیاندا مەرجی یەکتری ئافراندن مسۆگەرە. ئەوەی مەترسیدارەو بەهەڵە داچوونە ئەو هەلومەرجە راست نەپێوانە. ئەو کات لەبەرامبەر چارەنووسدا ئەستۆ نزمەکەی کەپێویستی تێگەیشتنی کێشە هەنووکەیەکان نییە، و نەچانسی چارەسەریش دروست دەبێت. "ئێستا"

وەکو دەرفەتێکی ئازادی و چارەسەری بینین، بەڵام بەمەرجێك بەدواداچوون بۆ دەرفەتەکەی لەحقیقەتی مێژوویدا بکەین. مەرجەکانی یەکتری دروستکردن لەنێوانیاندا چەندی گرنگ و پێویست بێت، جیاوازی لەنێوانیانیشیاندا دیتن ئەوەندە راست و خاوەن تایبەتمەندێکە کە پشتگیری دەداتە چارەسەری.
سەبارەت بە رەهەندی هزری کۆمەکی هەرە دوایش، پێویستە مرۆڤ لە تێروانین و پراکتیکی لە رەهەندی ئاین و ئەخلاقدا بەدوایدابچێت. دیموکراتیبوون بەتەنها لە رەهەندی هزری سیاسیدا چارەسەرکردن نەدادپەروەیەو نەویژدانیشە. کۆمەڵگا بەتەنها راستینەیەکی سیاسی نییە، راستیەکی ئەخلاقی و ئاینیشە. ئاین و ئەخلاق پێکەوە وەکو ئەو دەزگایەی کەبە هەزاران ساڵە لەسەر کێشەکانی کۆمەڵگا کە سەربەوانن، زۆر لەسەر وەستاون و چارەسەریان بۆ دۆزیونەتەوە. ئەو دەزگا مێژووی و دەستلێبەرنەدراوانە بەنبیندراو ژمێردران، بەتەنها لەسەر راستینەی ئابووری و سیاسی ئەنالیز "شرۆڤە"کردن و چارەسەری ئافراندن، بێگومان لاواز بمێنێت، لەبەر ئەوەش کراوە دەبێت بۆ هەڵەو کەموکوڕی. لەلایەك بخوازرێت کێشە چارەسەربین، لەلایەکی تریش رێگا لەبەردەم سەختکردنی کێشەکان بکرێتەوە.
یەکێك لەکاریگەرە رووخێنەرەکانی پۆزیتیڤیزم لەسەر کۆمەڵگاش، رۆڵی حەقیقەتی ئاین و ئەخلاقە لەچارەسەرکردنی کێشەکاندا دایخستۆتە ئاستی هەرە ژێر. دادوەری ئاین و ئەخلاق، لەئەنجامی لێتوێژینەوەو چارەسەری بە پێوانی ویژدانی و دادپەروەری کەبەتایبەت لەکلتوری رۆژهەلات و رۆژهەلاتی ناویندا، بەهەزاران ساڵە بەئەزموونی جیاجیادا تێپەڕیوون. هێشتا مەرجی لەسەر وەستاندنیان ماوە. بێ کاریگەر هێشتنی ئۆریانتالیزم"رۆژهەلاتناسی" بۆ ئەو رێگا چارەسەریە باوانەی رابردوو، فشاری دەسپۆتیزمی لەسەر کۆمەڵگا زیادکردوە، کێشە دیموکراتیەکانی سەختگیرترکردون. ئەگەر دادپەروەری و ویژدان نەبێت، ژیانی کۆمەڵگا بەردەوام نابێت. بەنزیکایەتی دەترمینیزم" قەدەرگەرایی" توند کە کەوتۆتە ئاستی ژمێریاری سەرمایەداری کەوەکو سەهۆڵ بەستویەتی، ئەوانەی ئابووریگەراو دەسەڵاتگەرا، ئەوەش رێگا لەبەردەم رەوشێکی گێژاو ئاسا کە سنورەکانی تێدەپەڕێنێ دەکاتەوە، ئەو راستیەی کە دەگوزەرێتیش بەشێوەیەکی گشتی بەمرەنگەیە.
لەچارەسەری دیموکراتی کێشەکانی کۆمەڵگادا کە گەیشتۆتە ئاستێکی هەرە مەزن، گەڕانەوەی دادپەروەری و ویژدان، خاوەن بەهایەکی دەستلێبەرنەدراوە. نمونە بۆ ئەوەی تراژیدیاکانی نەتەوەکانی وەك ئەرمەنی، ئاشووری و گەلانی تری وەکو ئەوان کەبینیویانە دەربازی بکەن، تواناو هێزی ئابووری و سیاسی ـ سەربازیان بەشناکات. بەتەنها وەکو ئەنجام کەوتنە تەڵەی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری کە لەمێژووی کلتوری رۆژهەلاتی ناویندا نەبینراوە، بۆ تێپەڕاندنی ئەو تراژیدیانەی کە ئەو گەلانە بینیان هاوکاربین، دەکرێت بەسەرلێدانی دادوەری ویژدانی و دادپەروەری ئاین و ئەخلاق کەبەردەوام لە کلتوری ئەم هەرێمەدا هەبووە چارەسەربێت.

ج ـ رەهەندە پرەنسیبیەکان"مبدا"
رەهەندی پرنسیپ گرێدراو بە رەهەندی هزریەوە پێویستە پێشبخرێت. ئەگەر چارەسەری دیموکراتی پێشبکەوێت، ئەوا لە رۆژانەی و کۆنژناکتۆر"دەرەوەی رەوشی توند و تیژ"بوون بەو لاتر، پێکهاتەکانیشیان لەخۆیدا هەمیشەییوون بێنێت. پێویستە چارەسەری کێشەکان بۆ رۆژئاواکردن نەبێت، پێویستە یان دەبێ خزمەت بەرزگارکردن بکا لەسیستەم، یان بۆ سەرلەنوێ ئاواکردنەوەبێت. بۆ کارگوزاری دەوڵەت و سەقامگیری هەمیشەی کۆمەڵگا چارەسەری بەو شێوەیە پێویست دەکات. بەگوێرەی ئەوەی دیموکراتی سیستەمی کۆمەڵگا و دەوڵەتە، پێویستە هەنگاوەکانیش بەسیستەم بن. پرەنسیبەکانی کەزیاتر دەتوانرێن پێشبخرێن رێزبەندیان دەکەم، باوەڕدەکەم بۆ پێکهێنانی سیستەمی دیموکراتی کەمترین مەرجن بۆ دروستکردنی چوارچێوەێکی هەمیشەیی.
1- پرەنسیبی نەتەوەیی دیموکراتی
نەتەوبوون کە یەکبوونێك پێکدێنێت، پێویستە وەکو دەوڵەت ـ نەتەوە نەبێت، وەکو نەتەوەی دیموکراتی ئاوابکرێت یان ئەوەتا ئەو نەتەوانەی هەنە وەك نەتەوەی دیموکراتی بژن و گۆڕانکاری بکەنە ئامانج. چەمکی ناسنامەی کراوەو نەتەوەی نەرم، دەتوانێت بۆ ئەم ئامانجە بەشی سەرەتایەکی ئاواکەربکات. ئەوەی لێرەدا گرنگە، نەتەوەیەکە کەلەناویدا یەکگرتنێك پێکبێت، نەبە فشاری دەسەڵات، لەسەر بنەمای ئارەزوومەندی دیموکراتی دروست ببێت یان ئەوتا بەگۆڕانکاری پێکبێت. لە نەتەوەی دیموکراتیدا ماف و ئازادیەکانی تاك و هاوبەش"کۆلەکتیف"هەیە، وەکو دوو رووی مەدالیا یەکتری تەواودەکەن. بەتەنها هاوڵاتیبوون ناخاتە ناوخۆی، کۆمەڵگای مەدەنی جۆراوجۆر، جەماعەت و گرووپەکانی تری خەڵکیش، وەکو یەکێتی کۆلەکتیف وەکو سەرچاوەی دەوڵەمەندی دەیانژمێرێت. هاوڵاتی هەرچەندە ببنە رەگەزی کۆلەکتیفیەکی کاریگەر، ئەوەندی تر ئاستێکی بەهێز دروستدەکەن.
2- پرەنسیبی وڵاتی هاوبەش"وڵاتی دیموکراتی"
پێویستە چەمکی وڵاتی هاوبەش"وڵاتی دیموکراتی" بەبنچینە وەربگیردرێت. یان چەمکی وڵات کە گرێدراوی ئەتنیکێکی یەك زمانی نییە، لەهاوڵاتیانی فرە زمان، فرە نەتەو و فرە ئاین دروستدەبێت، راستیەکەشی بەم شێوەیە. لەبەرئەوەش یەکگرتن و برایەتی هێشتا زیاتر پێشوازی لێدەکرێت و بەرێوەدەچێت. چەمکی وڵات تەنها سەر بە ئەتنیکێکە هەستیارێك دروست دەکات کە بەشێکی زۆر لە هاوڵاتیەکانی تریش وەکو ئەوێترن"ئۆتەکی". وەکو ئەوێتربوون جەمسەرگەرای زیاد دەکات، چەمکێکە لەبنەڕەتدا رۆڵی پارچەکردن دەبینێت. چەمکی هاوڵاتیبوونی کە لەهەمان کارگەدا دەرکەوتوون، ئاشکرایە کەسەرچاوەی خۆی لەفاشیزمەوە وەردەگرێت. هەمەڕەنگی دەوڵەمەندیەکی ژیانیە، گوزارە هەم لەسروشت و

هەم لەکۆمەڵگا دەکات. هەستی وڵاتپارێزی نەوەکو شۆڤینیەت و نەژادپەرستی، وەکو گرێدان بەخاك، ژینگەپارێزی هەستی پێدەکرێت، ئەویش ژیانکردنێکی هەرە راستە.

3- پرەنسیبی کۆماری دیموکراتی

شرۆڤە کردنی شێوەی دەوڵەتی کۆمار بە دەوڵەت ـ نەتەوە، کاریگەریەکی ترە بەتایبەت بۆ بانگێشە نەکردنی شێوازی دەوڵەتگەرا ـ نەتەوە کە توندڕەوە. بۆ کۆمار باشترین سیستەمی دەوڵەت، دەوڵەت ـ نەتەوە نییە، بەڵکو دەوڵەتی دیموکراتە. دەوڵەتێك ناتوانێت ببێتە دەوڵەت ـ نەتەوە دەوڵەتی دیمکراتە. ئەو دوو رەگەزە هەردووکیان پێکەوە ناکۆك دەبن. دەوڵەتی دیموکراتی بۆ سیستەمی دیموکراتی کراوەیە، ئەو دەوڵەتەی کە لەگەڵیدا رێك دەکەوێت. ئامانجێکی بەو شێوەیەی دەوڵەت ـ نەتەوە نییە، پێچەوانە کۆمەڵگای دیموکراتی لەناو خۆیدا دەتوێنێتەوە. پرەنسیبی چارەسەری دیموکراتی لەگەڵ کۆماردا رێك دەکەوێت، بەڵام هەمان رێکەوتن لەگەڵ دەوڵەت ـ نەتەوە ناتوانێت ئەنجامبدرێت. ئەوەی گرنگە مرۆڤ کۆمار وەکو رێکخستنێکی چەتر ئاسای دیموکراتی بیری لێ بکاتەوەو ئاوای بکات. ئایدیۆلۆژی نەکردنی شێوازی دەوڵەت یان کۆمار، بەئەتنیکێکەوە یان ئاینێکەوە گرێندان، بۆ چارەسەری دیموکراتی گرنگە. بۆ کۆمار پێناسەیەکی حقوقی وەکو رێکخستنێکی چەتر بۆ هەموو هاوڵاتیان پێشخستن لەجێی خۆیدایە. یان ئەوەتا کۆمار وەکو رێکخستنێکی حقوقی بۆ هەموو هاوڵاتیانی دیموکراتی پێناسەکردن زۆرگرنگە. بەم رەنگە پرەنسیبی کۆمەڵگا و پرەنسیبی عەلمانیەت، بەشێوەیەکی زۆر بەناوەرۆك دەگاتە پێناسەکردنێك. ئێمە تەنها بەو شێوەیە کەبەئاشکرا پێناسەدەکرێت دەتوانین بە ئەتنیکێك و ئاینێکەوە پەیوەستی نەکەین. نمونە بێ ئەوەی چەمکی" تورك" و "کورد" کە گوزارە لە نەژادی ئەتنیکێك دەکات، گوزارەی ئاینی و ئایدیۆلۆژی تر وەکو ئیسلامیەت و مەسیحیەت و سونەبوونی لەسەر زیادبکەین، گوزارە لێکردنەکەی هێشتا فرەوانترو یەکگرتووتردەبێت.

4- پرەنسیبی دەستوری دیموکراتی

لەگەڵ ئەوەی دیموکراتیبوون بزووتنەوەیەکی سیاسیە، تا ئەوکاتەی پابەند نەکرێت بەدەستورێکەوە کەبەرێکەوتنێکی کۆمەڵایەتی سازکراوە، ناتوانێت ببێتە رژێمکی بەڕێوەبردنی سیستەماتیك و هەمیشەیی. دەستوری دیموکراتی، گوزارە لەرێکەوتنی کۆمەڵگای دیموکراتی دەکات لەگەڵ دەوڵەت. ماف و ئازادیەکانی تاك، بەتەنها لەکۆمەڵگای دیموکراتیدا واتادارە. پێچەوانە لەبەرمبەر دەوڵەت ئەوەی هێزێکی زۆر گەورەشی هەبێت، کەلەوانەیە بتوانێت پاراستنی ئەو مافانەی خۆشی بکات. بۆ ئەوەی دەوڵەتیش نەوەکو دەزگایێکە کەبەردەوام کێشە دروست و سەختگیریان دەکات، بۆ ئەوەی بتوانێت لەرەوشێکی بەکاریگەر کە گۆڕەپانی شارەزایی و تاقیکردنەوەیە، چارەسەری دەئافرێنێ و بگردرێتەدەست، دەستوری دیموکراتی ئامرازێکی دەستلێبەرنەدراوە. دەستوری دیموکراتی کاریگەری لە دەوڵەت دەکات، بەتایبەتمەندیەکانی کەوەکو هێزێکی بەئەزموون و شارەزا خۆی دەگرێت، وەکو چەسپێکە کە کۆمەڵگاو دەوڵەت لەناو یەکتردا رادەگرێت.

5- پرەنسیبی چارەسەری دیموکراتی

پرەنسیبی چارەسەری دیموکراتی، مۆدێلێکی زیاتر چارەسەر ئامێزە کە دەوڵەتبوون ناکاتە ئامانج، بەڵام درێژکراوەی دەوڵەتیش نییە، دیموکراتی بوونی کۆمەڵگای مەدەنی یان کۆمەڵگای دیموکراتی بەبنەما دەگرێت. زیاتر لەبەڕێوەبردنی ژێرخانی دەوڵەت و شێوازە سەرەکیەکانی، بەرەو چارسەری ژێرخانی کۆمەڵگا لە رژێمێکی دیموکراتیدا بەبنەمادەگرێت. سەبارەت بەدەوڵەت تەنها داوای دەستورێکی دیموکراتی لێ دەکات. بێگومان بۆ دروستکردنی دەستورێکی دیموکراتی ئەگەر هەوڵە پراکتیکی و تیۆریەکان بەشبکەن، ئەو دەستورە لەدەوڵەت زیاتر، پێویستە دڵخۆشی کۆمەڵگا زیاتر بەبنەما بگرێت. لەدژی پرەنسیبی چارەسەری دیموکراتی، سەپاندنی چارەسەری دەسەڵاتداریەتی و دەوڵەتگەرایەتیە. وەکو پرەنسیب چارەسەری دیموکراتی بەدابەشکردنی دەسەڵاتداریەتیەوە خەریك نابێت، هەتا لەدەستیش بێت لەدووری دەوەستێت. لەبەر ئەوەی چەندی دیموکراتی قووڵ ببێت ئەوەندەش دووری دیموکراتی ژیاندەکرێت. ئەگەر بەتەنها بەناوی حکومەت و دەوڵەتان کۆمەڵگا سەرەڕاستکرابووایە، ئەو سیستەمەی دەرکەوێتە روو دژی دیموکراتی دەبێت. لەبەر ئەوەی هێزی کۆمەڵگا بەشداری ئەو کارە نەکراوە. سەر راستکردنەوەی دەسەڵاتداریەتی و حکومی ئەگەر بەلایەنی ئەرێنیەوە بێت، دەبێت رێگا لەبەردەم دیموکراتیبووندا بکاتەوە، بەڵام بەخۆی دیموکراتیبوون دروستناکات. ئامانجەکانی چارەسەری دیموکراتیش، دابەشکردنی دەستکەوتەکانی دەسەڵات یان دەوڵەت نییە. دەوڵەت ناگرێتە دەست، جەمسەرێکی دەوڵەت دروست ناکات، وەکو ئامانجی چارەسەری دیموکراتی نابینێت.

تایبەتمەندی سەرەکی پرەنسیبی چارەسەری دیموکراتی، دەزگاکانی دیموکراتی و دەزگاکانی دەوڵەت تاکو لەناو ئاشتیدا پێکەوە ژیان بکەن، لەلایەن دەستورەوە خستنە ژێر گرنتیە. لەنێوان هەبوونی هەردوو دەزگادا رەوابوونێکی یاسای هەیە. هەبوونی خۆیان پابەند ناکەن بەنکۆڵیکردن لەیەکتری. نەبە ناوی دیموکراتیەوە پاکتاوکردنی دەوڵەت پێویستە، نەبەناوی دەوڵەتیش توانەوەی دیموکراتی ئەنجامبدرێت. ئەو لەناو یەکتردابوونەی لەسیستەمی رۆژئاوادا، رێگا لەبەردەم ئەوە دەکاتەوە کە لەناو دەوڵەت ـ نەتەوەدا دیموکراتی بگۆڕێت بۆ دەزگایەکی تەنها بەبینرێت. کێشەی هەرە رۆژانەی دیموکراتیەت، سەر لەنوێ سەرەڕاستکردنەوەی پێکەوە ژیانکردنی هەردوو هەبوونی دەزگاکانە کە ئەو لەناویەکترە

تێپەڕێنێت. سنورداركردنی دەوڵەت بۆ دیموكراتی چەندە پرەنسیبێكی دەستلێبەرنەدراوبێت، دەوڵەتیش وەكو هێزێكی بەئەزموون و شارەزا، بۆ ئەوەی دیموكراتی رۆڵی چەتر ببینێت ئەوەندە پرەنسیبە. ئەوەی لەناو قۆناخی مێژوویدا بەسەركەوتووی دەربكەوێت، ئەوا كۆمەڵگای دیموكراتیە. بەكورتی وەستانی دەزگاكانی دەوڵەت و دیموكراتی لەناو ئاشتیدا، بەڵام وەستانێكی ئالۆزدەبێت، رەوشەكە رێگا لەبەردەم پێشبڕكێدا دەكاتەوە، ئەمەش گوزارە لەوە دەكات كە ئەوەی پێشكەوتوو سەركەوتو دەركەوێت ئەوا كۆمەڵگای دیموكراتی بۆخۆیەتی.

6- پرەنسیبی پێكەوەبوونی ماف و ئازادیەكانی تاك و كۆلەكتیف"هاوبەش"
لەپێكهێنانی پرەنسیبی ماف و ئازادیەكان كە لە چارەسەركردنی كێشەی دیموكراتیبووندا رۆڵێكی ژیانی دەبینێت، كەوتنە ناو جیاكردنەوەی تاك لە كۆلەكتیف، بەتەنها چارەسەركردنی كێشەكان زیاتر، كێشەكان زۆر زیاتر سەختگیرتر و وای لێ دەكات نەتوانێ لەناویدا دەربكەوێت. مرۆڤ دەتوانێت ئەمە لە ئەزموونی بێشوماری جیهانی فێرببێت. وەكوتر ئەو جیاكاریە، لەدژی سروشتی كۆمەڵگاشە. لەكۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا تاك لەهیچ كات و سەردەمێكدا، مافداربێ یان بێ ماف، بەئازاد بێت یان بێ ئازادی، بەبێ كۆمەڵگا نەژیاوە. خۆی لەخۆیدا تایبەتمەندی مرۆڤ، ئاژەڵێكی كۆمەڵایەتی پێشكەوتووە. لەبەر ئەوەش هەر ماف و ئازادیەك كە تاك بەدەستی خستووە یان ژیانی كردوە، هەتاكو لەگەڵ ئەو كۆمەڵەی كە پابەندی ئەوانە دابەشی نەكردبێت، گوزارە لەهیچ واتایەك ناكات. تاك كە لە كۆمەڵگا هاتبێتە دابڕان چەند بێ واتابێ، ئەو ماف و ئازادیانەشی كە بەدەستی خستوون ئەوەندە بێ واتان و خاوەن توانكاری پێكهێنان نییە. پێچەوانەكەی راستە: ئەو ماف و ئازادیانەی كە بۆ كۆمەڵگا دەستنیشانكراون، هەتاكو بۆ تاكەكانی كە پابەندی ئەون نەناسرێن، گوزارە لەهیچ بەهایەك ناكات. ماف و ئازادی بەبێ تاك ژیان ناكرێت. تاك لەماف و ئازادیەكانی بێ بەش هێشتن، لەوانەیە ئەو كۆمەڵگایەی كەئەندامەكانی پابەندن پێیەوە بیانخاتە هەمان دۆخەوە، كۆمەڵگاو كۆلەكتیفایەتیش لە ماف و ئازادیەكانی بێ بەش بكەی، بەو واتایە دێت كەتاكەكانی ئەندامی كۆمەڵگان ئەوان بخەنە هەمان رەوشەوە. بەكورتی ماف و ئازادی نە بەبێ تاك و نە بەبێ كۆمەڵگا هەتاكو پێكەوەنەبێت، پێكەوە بەشنەكرێت، نابێتە خاوەن هیچ نرخێك كە شایستەی ژیانكردنبێت.

7- پرەنسیبی سەربەخۆیی ئایدیۆلۆژی و ئازادی
لە بنەمای ئەم پرەنسیبەدا هەتاكو لە باڵادەستی ئایدیۆلۆژی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری كەلە گشتی جیهاندا باڵادەستە و خاوەن تایبەتمەندی ماتریالیزمی قەبە یە، لەناوەرۆكیشدا ئایدیالیستە خۆی وەكو" زانستی پۆزەتیڤیست" دەناسرێنێت رزگارنەكات، پێویستە مرۆڤ تێبگات كە دیموكراتی بوون ئەو ئازادیەی كەلە ناوەرۆكیدایە پێك نایەت. زانستی پۆزەتیڤیست پرەنسیبی سەرەكی شارستانی هەژمونگەرایی ئەوروپایە. هەتا ئەگەر ئەو پرەنسیبە باڵادەست نەكات، نتوانێت رەگەزەكانی تری بنچینەی وەك سەرمایەداری، ئەندوستریالیزم"پیشەسازی گەرایی" و دەوڵەت ـ نەتەوە لەهەموو جیهاندا، پەیوەست بەخۆی ئاوابكا و بەڕێوەیببات. باڵادەستی ئایدیۆلۆژی لە رۆژهەڵاتی ناوین، بە زانستی رۆژهەڵاتناسی زهنیەتەكان فەتح دەكات. دوای ئەمە یان لەگەڵیدا، فەتحكردن"ڤەبوون" بەرگەزە بنچینەیەكان، دەستبەسرداگرتن و داگیركەری بەرەنگی جیاواز پێكدێن. داگیركەری نوێ لەبەر سروشتەكەی بەرگەزە هەرێمیە دەستێۆتە"سەركوتكەر" كۆنەپەرستەكان لەناو هاوكاریدایە، كێشە دیموكراتیەكان هێشتا زیاتر سەختگیرتردەكات. هەرجۆرە بەرخودانێك كە لە بەرامبەریدا پێشدەكەوێت، لایەنێكی دیموكراتی لەگەڵ خۆیدا دەداتە ژیانكردن. بۆ ئەوەی ئەو لایەنە دیموكراتیە پێشبكەوێ و بەهێزببێت، بزانێت خۆی لەسەر پێ بگرێت، بەرەو شێوازی كەخۆی سیستەماتیزەبكات بچێت، پێویستە خۆی لە ئایدیۆلۆژیای هەژمونگەرا دابڕێت. بۆ ئەوەی هەڵبژاردنی ئایدیۆلۆژی ئەلتەرناتیف واتاداربن، پێویستە زۆرێك لە ئاستە هەرێمیەكان، شاری، نەتەوە زیاد لەهەرێمێك و وڵاتی هاوبەش بخاتە ناوخۆی. ئەگەر وانەبێت، لەوانەیە باڵادەستی ئایدیۆلۆژیەكەی تر پێش بكەوێت. تێڕوانینە ئاینگەرا باو رەگەزپەرستەكان، بەلای كەمەو ئەوەندەی باڵادەستی پۆزەتیڤیست كە ئایدیۆلۆژیای مۆدێرنیتەی سەرمایەداریە، باڵادەستن. دەركەوتنی ئایدیۆلۆژیای باسدەكرێن لەئاستی بنچینەییدانە و پابەندی ئازادیخوازین، مرۆڤ دەتوانێت وەكو ئایدیۆلۆژیای ئازادی هەڵیان بسەنگێنێت. بەتەنها بەم ئایدیۆلۆژیا ئازادانە دەتوانرێت كێشەكانی دیموكراتی و رێگاكانی چارەسەری تێبگەین و جێبەجێببن. تاكو ئازادی ئایدیالۆژی نەبێت، هەر كاتێك دەتوانرێت هەنگاوەكانی دیموكراتی ئاستەنگ بكرێن، بكەوێتە ژێر كۆنترۆڵی ئایدیۆلۆژیای باڵادەست. ئازادی ئایدیۆلۆژی بەحەقیقەتی سروشتی كۆمەڵگاوە پەیوەستە، بەجێبەجێكردن و ژیانكردنی كۆمەڵگای دیموكراتیەوە كەبەردەوام گوزارشت لەخۆی دەكات. حەقیقەتی كۆمەڵگا، بەئازادی گوزارشتكردنە لەراستیەكانی كۆمەڵگای دیموكراتی.

8- پرەنسیبی مێژووی بوون و ئێستایی بوون
كێشەكانی دیموكراتیەت و دەرفەتەكانی چارەسەری، بەراستی دروستكردنی پەیوەندیەكان لەنێوان مێژوو و ئێستادا،

لەنزیکەوە بەیەکەوە پەیوەستن. زهنیەتێك كە كێشەكانی بەمێژووەوە پەیوەندیدارن و دەرفەتی چارەسەری نابینێت، سانسۆر دەكات، نەتەنها كێشەكانی دیموكراتیبوون، ئێمە ڕێگا بدەین بۆ تێگەیشتنی هەموو كێشە كۆمەڵایەتیەكان، لە دۆخێكی وەرچەرخاندا بەرەو سەختگیركردن و دۆخێك كەناتوانێ لەناویدا دەربكەوێت، قەیران، پێكهەڵپژان، شەڕ دەستلێبەرنەدراوە. ئەو ڕووداوانەی لەمێژوودا ڕوویانداوەو بەڕێووەچوونە، مەرجی سەرەكین بۆ دیاری كردنی ئەمڕۆ. ئەوەی ئێستاش یان ڕۆژانەی، لەو ڕەوشەی كە مێژوو خۆی لەگەڵ كێشەو دەرفەتەكانی چارەسەری پێشكەش دەكات پێكدێت. تەنها جیاوازیەكەی ئەمەیە: ئێمە ناتوانین دەستلە ڕابردوو وەربدەین ، بەڵام ئێمە دەتوانین دەست لەئێستا، یان ڕۆژانە وەربدەین. بەبنەمای ژیری و هێزی مادی دەستتێوەردان، دەتوانیین ڕۆژانە بگۆڕین. دەتوانین گۆڕانكاری خێراتربكەین، بەرەو لایەكی جیاوازی وەرگێڕین، ئازادی بكەین یان هێشتا زیاتر كۆیلەی بكەین. ئەمە بەتەواوی ڕەگەزێكە كە بەئاستی هێزی دەستتێوەردانەوە گرێدراوە. ئەوەی گرنگە وەڵام بۆ پرسیاری" ڕابردوو، مێژوو بە ئەڵقە بنچینیەكانی خۆیەوە چۆن لەئێستادا نیشانبدرێت؟". ئێستا وەكو گوزارەیەكە ئەو گۆڕەپانە پەیوەندیدارانەی مێژوو كە ئێمە پێیانەوە پەیوەندیداردەبین لێی تویژێنراوەتەوە، كلیلی چارەسەری كێشەكانی كۆمەڵگایە. لەو مانایەدا ئەگەر لە مێژوو تێبگەین، ئەوا ببێتە سەرچاوەیەكی گەورەی هێز بۆ ئێمە. ئەوانەی ناتوانن لەمێژوو تێبگەن و ناتوانن بینووسن، گوومانێكی كەمە بتوانن بەڕاستی لەئێستا تێبگەن، ئازاد و دیموكرات بكەن. ئازادی و دیموكراتی بەتێكەڵاوی ژیانكرابن، هەمیشەی نابن، چۆنی بەدەست دەخەی، لەوانەیە واشت لەدەست بڕوات.

پێویستە باش بزانرێت كە كۆمەڵگا بۆ خۆی پێشكەوتووترین مێژووە. كۆمەڵگایێك كەبەخۆی مێژووە، هەتاكو بەڕووكەی و حەقیقەتەكە نەناسرێت، ئەوا ڕزگاركردن لەكێشە، گەیاندنە چارەسەری و شێوازی ژیانی دیموكراتی، دەرفەتێكی ئەوتۆی نییە. لەبەر ئەوەیە چالاكیە سەرەتایەكان كە دەسپێوتەكان پێكی دێنن، لەناو بردنی مێشكی كۆمەڵگایە. ئەوەی پێویستە سەرەتا دیموكراتەكان بیكەن، خاوەن دەركەوتنە لە مێشكی كۆمەڵگا یان لە مێژوو بەشتە ڕاستەكان. خراپكاری هەرە گەورەی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری، مێشكی "حافیزە"ی مرۆڤایەتی ڕووبەڕووی گورزی لەناوبردن دەكاتەوەو ئێستاش وەكو بێ كۆتا، یان ڕاسترە وەكو كۆتای مێژوو نیشانیدەدات. بەگوێرەی ئەو هەمووشتێك لەئێستادا كە تەنگ بووە پێكدێت. ئەو نەخۆشیەی كە پێی دەگووترێت" تاكڕەویەتی" لەم چەمكەوە سەرچاوەدگرێت. تاكڕەویەتی" بۆخۆت بژی، وەكوتر بێكەلكە"، پەیوەستە بەنكۆڵیكردن لەمێژووی كۆمەڵگا. لەزهنیەتێكی ئاوەهادا حەقیقەتێكی كۆمەڵایەتی و كۆمەڵگابوونێكی دیموكراتی كە هیوا ناكرێت ئەو حەقیقەتە بگاتە گوزارە لێكردنێك. لەو لایەنەوە تاكڕەویەتی لیبراڵ نكۆڵیكردنە لەدیموكراتی. لەمێژوودا كلیل، لەكلیلیشدا مێژوو دیتن پرەنسیبی ڕاستی زانستی كۆمەڵناسیە.

9- پرەنسیبی ئەخلاق و ویژدان

سۆسیۆلۆژیای" زانستی كۆمەڵناسی" ڕۆژئاوا ویژدان ناناسێت. وەكو ژیری ئەنالیتیك بەڕێوەدەچێت. ویژان پێویستی بە ژیری سۆزداری هەیە. سۆسیۆلۆژیای مۆدەرێن كە وەك فەلسەفەی ئەنالیتیك دەستپێكردوە، لەڕۆژی ئەمڕۆدا گۆڕاوە بۆ بەڕێوەبەرایەتیەكی تەكنیكی. لەراستیشدا ویژدان، لەژوور پرەنسیبەكانی پێكهینانی كۆمەڵگا دروستدەكات دێت. ویژدان وەكو دادوەریەكی دادپەروەری كۆمەڵگا ڕۆڵ دەبینێت. كاتێك بەهیچ ژمێردرا، كۆمەڵگا وەكو ئامێرێكی درندەی زۆر مەترسیدار بەڕێوەدەچێت. دەتوانرێت ویژدان وەكو ناوەڕۆكی ئاین و ئەخلاقیش بژمێردرێت. ئەگەر ئێمە وەكو دابونەریتێكی وشك ئاین و ئەخلاق لەلایێك دابنێین، ئەوا ببینرێت ئەوەی لەو دەزگایانە هەردووكیان لەدواوە دەمێنێتەوە، ویژدانی كۆمەڵگایە. ویژدانی كۆمەڵگا گۆڕەپانی یەكەمە بۆ ئەو هێزانەی كە لەلایەنی سیاسی، ئابوری و سەربازی لاوازن دەتوانن پابەندی بن. كاتێك ئەو گۆڕەپانە تێكدرا، لەكۆمەڵگادا ئەوكات بەتەنها پرەنسیبی هێز بەڕێوەبچێت ئەوكاتیش هەركەس ببێتە گورگی یەكتر. دیموكراتی ڕژێمێكی وایە كەناكرێت بێ ویژدان بەڕێوەبچێت. هێزی قۆرخكار و سیستەمی سەرمایەداری، لەسەر نكۆڵیكردن لە ویژدان هاتۆتە ئاواكردن. لەناوەڕۆكدا دیموكراتی بوون وەكو بزووتنەوەی بێ كاریگەركردنی ئەو نكۆڵی كار و ویژدانەیە و دەتوانرێت بەوەدەستخستنی ویژدانی كۆمەڵگاش پێناسەبكرێت. كۆمەڵگای زۆرینە كەلەدەرەوەی هێزی قۆرخكاری سەرمایەدا دەمێنێت، تەنها دەتوانێت بەجموجۆلی ویژدان بپارێزرێت. لەرۆژگاری ئەمڕۆدا تێكۆشانی كۆمەڵگا، بەواتایەكی تر بەدەستخستنی ئەو ویژدانەیە كە ونكراوە. تاكو دیموكراتی بوون نەبێتە جولانەوەی بەدەستخستنی بەها ویژدانیە ونكراوەكان، ناتوانێت بگاتە مانای خۆی بەتەواوی، تاك و كەمەنەتەوەكان ناتوانن ماف و ئازادیەكانیان بەدەستبخەن. ئەم بیانوانە هەموویان پێویست دەكات چونكە پرەنسیبی ویژدان و بەهاكانی كۆمەڵگا لە ئاین و ئەخلاق تێپەڕیوون، لەچارەسەركردنی دیموكراتیدا بەرەهایی پێویستە لەكاردابن.

ڕاستینەی كۆمەڵكوژی، هەتا ویژدان نەكەوێتە جموجۆڵ چارەسەرنابێت. هەموو كوشتن و لەناوبردنەكانی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری، بەتەنها كاتێك پرەنسیبی ویژدانی كەوتنە جموجۆڵ دەتوانرێن دانییپابنێن و ڕێگا لەبەردەم دادپەروەری بكاتەوە. مۆدێرینیتە لەهەموو كێشەكانی كۆمەڵگادا پرەنسیبی هێزی سەرەكی دەگرێت. ئەوەی خاوەن هێزە قازانج دەكات یانیش چارەسەردەكات، ئەوەی كەنیازیشی لەدەستدەدات و لەراستیدا دەردەكەوێت. نەخۆشی هەرە مەزن لەبنچینەی مۆدێرینیتەدا ئەمەیە.

كۆمەڵگا بەم پرەنسیبە، بەتەنها وەرچەرخێتە وەحشیتگەریەكی كەلە سەردەمی بەردین خراپتر. ئەگەر ئێمە دەمانەوێت بۆ كێشەكانی كۆمەڵگا كەلەسەرووی ئەم كێشانەوە دێن، بۆ دیموكراتیبوون وەڵامێكی ڕیشەی، هەمیشەی، دادپەروەر ببینین،

پێویستە ئێمە لەجیاتی پرەنسیبی هێز، بەرهابوونەوە جێگا بدەینە پرەنسیبی ویژدانی. کلتوری رۆژهەلاتیش نامۆ نییە لەپرەنسیپێکی بەو رەنگە. پێچەوانە لەهەموو کێشەکانیدا شوێنێکی سەرەکی داوەتە ئەم پرەنسیبە. سەرمایەداری، لەبەر حیسابەکانی وەك سەهۆلی، واز لەم پرەنسیبەی بەرنادات. کاتێك ئێمە بۆ کێشە دیموکراتیەکانی تورکیا چارەسەری دەئافرێنین، پێویستە ئێمە لەسەرووی هەموو پرەنسیپەکان شوێن بدەینە پرەنسیبی ویژدانی و پێویستە ئەو پرەنسیبە بەسەربکەینەوە.

10- پرەنسیبی پاراستنی بنەڕەتی دیموکراتەکان

لەرۆحێکی یەك خانەیدا هەتا لەوانەی رۆحیشیان لەبەردا نییە باوەڕیان پێدەکرێت، کەبەو شێوەیە نییەو هێشتا لەو لاتریش ژیانی پارچەکانی ژێر ئەتۆم کە بنەمای پرەنسیبی هەموو رۆحەکانە هیچ زیندەوەرێك بێ پاراستنی بنەڕەتی نییە، ئەوەش راستیەکەو دەزانرێت و لەلایەنی زانیستیشەوە سەلمێنراوە. ئەمەش دەبینرێت کە هەبوونی وەکو کۆمەڵی مرۆڤان کەهەتا دوای ژێرن و ئاستی نەرمبوونیان زۆر بەرزە، لەهەر کاتێکی ژیان و لەهەر سەردەمێکدا، بێ پاراستنی بنەڕەتی نابن. شەڕیش کە لەلایەن سیستەمی شارستانیەوە لەناوەڕۆکی خۆیان هاتوونەتە دەرخستن، ئەمەش لەنزیکەوە پەیوەستە بەچەمکی پاراستنی بنەڕەتیەوە. کۆمەڵگای دیموکراتی و تاکە ئازادەکانی، لەسەردەمی شارستانیەتی چینایەتیدا بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن، رووبەڕووی کێشەی پاراستنی گەورەبوونەوە. هەتاکو کۆمەڵگای کۆمینالی سەرەتاش، لەژیانی دووروو درێژیاندا، لەگەڵ ئەو ناکۆکیە ناوخۆیانەی کە هەیانبوون، رووبەڕووی مەترسی مردن دەبوونەوە لەبەر پێکهاتە رۆحی و نارۆحیەکان سرووشتدا پاراستنی بنەڕەتیان وەکو ئەرکێك بۆ خۆیان بینی لەهەر کات و سەردەمێکدا.

لەبەرامبەر گوشار و داگیرکاری پاوەنخوازدا ئەوانەی بەرگەزی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری"دەوڵەت ـ نەتەوە، سەرمایەداری و پیشەسازیگەرایی" لەسەر کۆمەڵەی ئابووری، ژینگەپارێزی و دیموکراتی، لەسەر تاکە ئازاد و یەکسانەکانیان بەرێوەیان بردووە، کێشەی پاراستنی بنەڕەتی لە سەرووی بابەتەکانی ژیانەوە دەهات. ژیانێکی بێ پاراستنی بنەڕەتی، تەنها بەکۆیلایەتیەکی بەمووچە کەئەنجامگیرە دوای لێ نایەت، رێگا لەبەردەم هەرجۆرە بێکاری، نەخۆشی و گەندەڵیدا دەکاتەوە. لەمەش هێشتا خراپتر، لەگەڵ خۆیدا بەژمارەیەکی زۆر لەناوبردنی جەستەیی و کلتوریش دێنێت. مۆدێرینیتە وەکو سیستەم بەگشتی کۆمەڵگا و تاکەکانی، بەتایبەتیش بەشێوەیەکی هێشتا توندتر کۆمەڵگای دیموکراتی و تاکە ئازادەکانی، رووبەڕووی ناچاری پاراستنی هەبوونی خۆیان دەکاتەوە. ئەگەر پاراستنی بنەڕەتیان بەسەر نەخەن، نەتەنها ئازادیەکەیان، بەڵکو هەبوونیشیان رووبەڕووی مەترسی لەناوچوون دەکرێنەوە. رەگەزی قۆرخکاری مۆدێرینیتە، بۆ ئەوەی بتوانن بەردەوامی بەخۆیان بدەن، بەتەنها بەهەڕەشەکردن لەئازادی و هەبوونی کۆمەڵگا و تاکەکان وە ناوەستێت، بەڵکو لەسەردەمی هەرە دوایشیدا مەرجی ژینگەیی کەبۆ ژیان دەستلێبەرنەدراوە لەناودەبات. لەناوبردنی مەرجە ژینگەیەکان، وەکو لەناوبردنێك بەرەنگێك لەسەر هەموو ژیاندا لەماوەیەکی درێژدا بڵاودەبێتەوە.

کۆمەڵگای دیموکرات و تاکی ئازاد، لەپێناو پێشکەوتن و گۆڕانکاری شۆڕشگێڕانەدا، لەگەڵ ئەوەشدا ناچارن کە پاراستنی بنەڕەتی خۆیان بکەن. لەبەر پێکهاتەی قەیراناوی مۆدێرینیتەدا لەو ماوەیەی دوایدا پاراستنی بنەڕەتی لەسەرووی هەموو کێشەکانەوە بەجێکردووە. ئابووری و ژینگەی هەر کۆمەڵەیەك هەتاکو دەگاتە گروپێك، ناچارن کە پاراستنی بنەڕەتی بۆ ئەو گرووپە دابین بکەن. هەمانکات بۆ هەر تاکێکی ئازاد و یەکسان و دیموکراتدا لەلایەنی ئابووری و ژینگەپارێزیەوە دەتوانن گرووپێك یان چەندین گرووپ پێکبێنن. ناچارن پاراستنی بنەڕەتی بۆ گرووپێك یان هەموویان پێکەوە دابین بکەن. بەخێوکردن بۆ هەموو رۆحەکان پێویستە. زاوزێکردن و پاراستن لەهەرکەسێك زیاتر بۆ کۆمەڵگای مرۆڤایەتی پێویستە وەکو سێ مەرجی ژیانی دەستلێبەرنەدراون.

بەشی سێیەم: لەتورکیادا کێشەی دیموکراتی و چارەسەری دەستوری دیموکراتیانە

أ- لەتورکیادا دەرکەوتنە رووی کێشەی دیموکراتی، پێشکەوتن و ئەنجامەکانی

وەکو راستیەکی گەردوونی کێشەی دیموکراتی، لەکۆمەڵگای تیرەکاندا کاتێك بەرێوەبەرایەتی پلەداری سەروو لەیەکتر جیابوونەوە دەرکەوتووە. جیابوونەوەی ئیداری لەکۆمەڵگای تیرەکاندا کەلەناوخۆیاندا دیموکراتیەتێکی سروشتی هەبوو، کۆتای بەدیموکراتیەتی سروشتی دێنێت. لەپلەداریەوە تێپەڕبوون بۆ دەوڵەتی داپلۆسێنەر، ئەو قۆناخە کورتر دەکاتەوە. سیستەمی شارستانی لەناوەڕۆکدا لەلایەن ئەم قۆناخەوە دیاری دەکرێت. شارستانی تاکو قۆناخی سەرمایەداری لە ئەورووپا، لەسەر کۆمەڵگا لەئاستێکی سنورداردا باڵادەست دەبێت. کۆمەڵگاش توانستە ئەخلاقی و سیاسیەکانی دەپارێزێت. شارستانیەتی ئەورووپا ئەو جیاکاریەی لەراستینەی نەتەوە و دەوڵەت ـ نەتەوەدا، لەبەر پێویستی سەرمایەداری و پیشەسازگەرایی ـ دەناسێت، کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسیش بەشێوەیەکی قووڵ پارچە دەکات، بەقووڵایی دزە دەکاتە ناو کۆمەڵگا. ئەو کەوتنە ناوە وەك دەسەڵاتداریەتی ئایدیۆلۆژی و قۆرخکاری سەرمایەداری، رێگا لەبەردەم تەحکومێکی بێ رادە دەکاتەوە. مۆدێرینیتە تاك دەخاتە رەوشێکی زۆر لاوازەوە. ئەو خەباتەی دەکرێت دەخوازرێت بەچاکسازی سنوردار بوەستێندرێت. دیموکراتیەتی ئەورووپا دەیەوێت بە ریفۆرم تاك و کۆمەڵگا لەسەر پێبگرێت. ماف و ئازادیەکانی تاك، دەوڵەتی یاسا، ناوەڕۆك و چوارچێوەی ئەو یاسایانە ئاوادەکات. یەکێتی ئەورووپا گوزارە لە رەوشی بنچینەی ئەم سیستەمە دەکات. بەڵام لەبەر ئەوەی سیستەمی قۆرخکار باڵادەستی خۆی لەسەرەوە

بەردەوام دەکات، سیستەمی دیموکراتی کەدەرکەوتوتە مەیدان، هەبوونی سیستەمێکی دەسەڵاتداریەتی کەتا دوای بەرتەسك کراوەتەوە کەوتوتە ژێر کۆنترۆڵ، ناتوانێت زیاتر بەرەوپێشەوە بچێت.
کلانەکانی سیبیریا کەتایبەتمەندی پەیوەست بەخۆی هەیە، لەناو قۆناخی دوای توانەوەی بەستەڵەکەکان لە بنارەکانی سیبیریای باشوور لەماوەی ساڵانی"7000"پ . ز بەدواوە، بەکاریگەریەکانی شۆڕشی نیۆلۆتیك کە سەرچاوەکەی ڕۆژهەڵاتی ناوینە، لەماوەی ساڵانی"4000" پ . ز بەرەو ژیانکردنی شۆڕشەکانی نیۆلۆتیکیان دەچن. ساڵانی"2000"پ . ز یانیش لەپلەداری"هیرارشی" دەربازی شارستانیەتی دەوڵەتی دەبن. شارستانیەتی سەرەتا کەناوەندەکەی چین ی ئەمڕۆیە، لەساڵانی "1500"پ . ز دەردەکەوێتە مەیدان. لەگەڵ دەوروبەریان بەپرۆتۆتیپەکانی"شێوەی وێکچووی مرۆڤ" ئەمڕۆکەی گەلەکانی ژاپۆن، کۆریا، ڤێتنام، مەغۆلستان، تورکستان دا، بەردەوام لەناو تێکۆشاندابوونە. ئەو خەباتەی لەبەرامبەر شارستانیەتی چین، مرۆڤ دەتوانێت وەکو دیموکراتیەتی سروشتی هەڵسەنگێنێت. لەنوسراوە مێژوویەکانی چین دا جاری یەکەم بەناوی "هوون" باسی باوباپیرانی تورکەکانی ئەمڕۆدەکرێت. لەبەر ئەوەی شاخەکانی "هوون" دیموکراتیەتێکی سەرەتای ژیاندەکەن، لەگەڵ شارستانیەتی چین دا بەردەوام لەناو تێکۆشان دابوونە. ناتوانن بەئاسانی بیکەنە شارستانی. ئەو شاخانە کاتێك زەحمەتی دەبینن، ڕووی خۆیان دەدەنە ڕۆژئاوا. هوونیە ڕۆژئاوایەکان لە"400"پ . ز دا هەبوونی لەئەورووپای ناوین تاکو ڕۆما، لەهەرێمێکی بەرفرەواندا بەردەوام دەکەن. بەڵام ناتوانن خۆیان لەتوانەوە لەناو شارستانیەتدا ڕزگاربکەن. لەلایێك لە ڕۆژهەڵات چین، لە ڕۆژئاواش لەلایەن شارستانیەتی کە بنەچەکەیان سلاڤن، بەردەوام دەتوێنرێنەوە"ئاسیملەدەکرێن". ئەو قۆناخە سەرەتا هەرچەندە خوازرا بەرێگای ئاینی هیندی و مانیزم بشکێندرێت، شکاندنی سەرەکی بەئیسلامیەت دروستدەبێت. ئەزموونی دەوڵەتەکانی گۆکتورك و ویگوور ئەوانەی دەویسترا پێش ساڵانی"550 یان 740" دروستبکرێن، لەکۆنفیدراسیۆنێك زیاتر بەولاتردا نەچوو.
شارستانیەتی پرۆتو ـ تورکی سەرەکی، دوای ئەوەی لەگەڵ ئیسلام بەشێوەیەکی جدی کەوتنە ناو دانوستاندن و لەسەدەی "9"مینەوە کە ئیسلامیان پەسندکرد، دەستیان بەپێشکەوتن کرد. تورکبوون و کێشەکانی دیموکراتی کە لە کاراهانەکانەوە دەستپێکردوە درێژدەبێتەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆ، بەو قۆناخەی شارستانیەتیشەوە لەنزیکەوە پەیوەستە پێیەوە. شارستانیەتی تور ـ ئیسلامی ڕۆژهەڵاتی ناوین، بەگشتی لەبەگایەتی سەلجوق بەگەوە دەستیان پێکردوە. پرۆتو ـ تورکان ویستویانە سەرەتا خۆیان لەرۆژهەڵاتی ناوینەوە نیشانبدەن. بەڵام وەکو جەماوەر و بەڕەنگی چیایی، باش دەزانرێت کە جاری یەکەم بە سەلجوق بەگ و کوڕەکانیەوە لەرۆژهەڵاتی ناوین بەجیهانی بوونە. کاتێك سەلجوق بەگ دەیویست لەرۆژهەڵاتی ناوین شوێنێك بۆ خۆی دروستبکات، ڕووبەڕووی دوو شەپۆلی ئاینی بۆتەوە: موسەویەتی و محمەدیەتی. ناوی موسەوی لەچوار کوڕی ناوە، ئەوە نیشاندەدات کە بەڕەنگێکی جدی لە دەوڵەتی تورکی یەهودیەکانی هازاراوە کاریگەر بووە. تاچەند موسڵمان بووە، لەبەر ئەم هۆکارە بەتەواوی نایێتە شیمانەکردن. لەوانەیە تورکایەتی بە ئیسلامەوە پەیوەست کرابێت. لەبەر ئەوەی بەر لەوە لەدەرەوەی ناوی گۆکتورك کە ماوەیەکی زۆر کورت بەردەوام بووە، ئێمە ڕووبەڕووی هیچ شارستانیەتێك بەناوی تورك نابینەوە. دەتوانرێت شیمانە بکرێت کە ئەو ناوە لەلایەن عەرەبەکانەوە دانرابێت. بەڵام دەبێت باشبزانرێت کە پێش ئەوەی سەردەمی نەتەوەپەرستی دەستپێبکات، کۆمەڵگاکان ناسنامەکانیان نەبە نازناوی خۆیان، بەڵکو بەناوی ئاینەکەیانەوە دیاریاندەکرد. لەو کاتەدا یان دەبوونە ئیسلام یان ئاینێکی تر. ڕاستینەی کۆمەڵگا بەو شێوەیە ئاواکرابوو.
بەگایەتی سەلجوق لەسەدەی "11"و بەدواوە، لەسەر بەرزایەکانی کەلەژێر کۆنترۆلیدایە، باڵادەستیەکی توند ئاوادەکات. خەڵکی بەرزایەکان لەبەرامبەریدا بەشێوەیەکی سەخت بەرگری دەکەن. بەگوێرەی ئەوەی لەمێژوودا تۆمارکراوە، خەڵکی بەرزایەکان کە ئۆغوز ـ تورکە ئەوانەی سەرەتا کە لە ساڵی "1017"دا چوونەتە ئێران، ئەوانەی سکاڵایان هەبووە لەتوندو تیژی باڵادەستی بەگ. ئەو جەماوەرە نزیکەی"5000"هەزار کەس بوونە، ڕزگاری خۆیان بە ڕاکردن بۆ ئێراندا بینیوە. ئاشکرایە کەلەناو خەڵکی ئەو بەرزایانەی کە دەربازی ڕۆژهەڵاتی ناوین بوونە، هەر لەسەرەتاوە لەبەرامبەری شارستانیەتی کەوەك شاربوون ـ چینبوون ـ دەوڵەتبوون بەرەو پێشەوە دەچێت، بەرخودانیەکی سەخت هەیە. تیرەکانی ئەو بەرزایانەی کە ناوی تورکمانیان پێ بڕاوە دەیانەوێت بیان چەوسێنەوەو بیانکەنە کۆیلە، ئەوانە خەڵکی ئەمڕۆ و ناوکی سەرەتان. ئەو ئارستۆکراسیەتیەی بەرزایەکان وەکو ئەوەی تورکمانیان بچووك بینی، ناشیانەوێت خۆیان وەکو تورك ناودێربکەن. حەزیان لەناوەکانی وەکو عەرەب و فارس، شا و سوڵتانە دەکەن. بە عەرەبی، فارسی و بەزمانی عوسمانی کە لە هەموویان پێکدێت بەکاردێنن. تورکیایەتی سەرەکی و ڕەسەن، لە بەرزایەکانی تورکمانەکاندا ژیاندەکات.
ئێمە ئەگەر ئەو کورتە مێژووە لەلایەنی کێشە دیموکراتیەکانەوە شرۆڤە بکەین، دەتوانین ئەوا بڵێین:
تورکە بەرزای نشینەکان لەگەڵ دەربازبوونیان بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوین لەسەدی"11"و بەدواوە، جیاوازیەکی چینی جدی هاتۆتە ئاراوە، مرۆڤ دەتوانێت ئەم قۆناخە وەکو سەرەتای دەستپێکردنی کێشەی دیموکراتی بەدەست بگرێت. تورکمانە بەرزایی نشینەکان کە سوڵتانی دوایی سەلجوقیان سوڵتان سنجار خستنیە قەفەسەوە و هەتاکو مرد لەگەڵ خۆیدا گەڕاندن، لەڕاستیدا زۆرباش دیاردەبێت کە چەند حەز لە ئازادی و ژیانی دیموکراتی دەکەن. لەگەڵ ئیسلامیەتدا جیابوونەوەی دوو گرووپی سەرەکی تورکی بەرزایی نشین، ناوەڕۆکی کێشەی دیموکراتی دروست دەکات. ئارستۆکراتیەت، لەڕاستیدا ئارستۆکراسیەتی سەربازی و ئاینی و خاوەن خاك، لەناو دەوڵەتدا بەهێزبوون و قۆرخکاری دەسەڵاتگەریەتی دروستکردن، بەشی ئەو هەژارانەی لە سیستەم دوور خراون یان وەکو خەڵکی بەرزایەکان و کۆچەرەکان یان ئەوانەی کۆن لە کوێستانەکانەوە بەرەو دەشتەکان، یان لە دەشتەکانەوە بەرەو کوێستانان نادەن، یان وەکو هەژارەکانی شار و

گوند ژیانیان بەپیشەوەری و جوتیاری بەردەوام دەکەن. ئەو جیاکاریە لەناو هەموو گەلانی رۆژهەڵاتی ناوین ژیانکراوە، بە ژمارەیەکی زۆر لە سەرهلدان و کۆرەو بەئەنجام بووە. جیابوونەوەی ئاینزاکانیش بەو راستیەوە گرێدراوە. سوونەگەرایی وەکو ئاینزای چینی سەردەست فەرمی بوو، ئاینزا بەرهەڵستکارەکانی وەکو عەلەوی، شیعەگەریەتی، موعتەزیلە، مەولەویەت و بەکتاشیەتیش، لەناو نیوشاراوەییووندا هەبوونی خۆیان بەردەوامکرد. لەچاخی ناویندا تێکۆشانی دیموکراتی، لەشێوەی نزیکبوونی ئەو ئاینزایانەوە دەکرێت. دیموکراتیەتی ئەوکات، دەخوازێت کە بەو ئاینزایانەوە جێبەجێبکرێت. وەکوتر ژیانی خێڵە کۆچەرەکان خۆی لەخۆیدا تێکۆشانی دیموکراتیە. ئەو ناوەڕۆکەی بەرخودانوانەکان لەهەموو سیستەمی خێڵ و تیرەکانی چاخی ناویندا، وەکو تێکۆشانی دیموکراتی شرۆڤەکردن، شێوازی گوزارە لێکردنێکی هەرە راستە. ئەگەر ئێمە ئیسلامی فەرمی وەکو قۆرخکاریەکی ئایدیۆلۆژی شرۆڤەبکەین، ئایدیۆلۆژیای ئاینزا نیو شاراوەکانیش مرۆڤ دەتوانێت وەکو بێژەی دیموکراتی هەڵسەنگێنێت. ئەو بزاڤە جەماوەریەی کە هەتا سەرەتای سەدەی"19"وە بەردەوام بوو، دوای ئەوەی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری لە رۆژهەڵاتی ناوین بەکاریگەربوو، ئەوا بکەوێتە قۆناخێکی نوێ. لەلایێك ئەو ئیمپراتۆرانەی کە هەژموونگەرایی کۆنن، بە نزیکایەتیەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە لەبەر یەك هەڵدەوەشێن، لەلایەکیتریشەوە ئەو دەوڵەت ـ نەتەوە بچووکانەش کە دەکەونە شوێنی ئەوان، کێشەی دیموکراتی هێشتا سەخت تر دەکەن. دەوڵەت ـ نەتەوە نوێنەرایەتی بیانیبوونێکی دوو بەرابەر دەکات: لەلایێکەوە بیانیبوونێك کە لە دەسەڵاتداریەتی شارستانیەتی کۆندا ماوەتەوە، لەلایەکیتریش بیانیبوونێکە کە دەوڵەت ـ نەتەوە وەکو مۆدێرینیتەی سەرمایەداری دایدەسەپێنێت. قۆرخکاری دسەڵاتداریەتی کە گەلێك زیادیکردوە، لەسەر کلتوری گەلان رژێمی کە لە ئاستی کۆمەڵکوژکردندان بەڕێوەیان دەبن. بەدەستی دەوڵەت سەرمایەداریگەرایی، بوورژواگەرایی و فاشیستبوون، لەناو یەکدا بەڕێوەدەچن. تورکیا ئەو قۆناخەی بەدەستپێکردنی سەدەی"20"م بەشێوەیەکی زۆر بەرفرەوانی ژیانکردوە. ئەو بزووتنەوەی خۆی بەناوی جەمعیەتی ئیتیحادو تەرەقی ناساند، گوزارشت لەو راستیە دەکەن.
هەموو رووداوەکان ئەوە نیشاندەدەن کە جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقی ساڵانی"1920"، پرۆتۆتیپی پارتی سۆسیالیست ناسیۆناڵی ئەڵمانیا و پارتی فاشیستی ئیتاڵیایە. لە زۆر لەو وڵاتانەی کەدرەنگ بوونە سەرمایەدار، ژیانکردنی هەمان پێشکەوتن رێکەوت نییە، پەیوەستە بەهەبوونی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری. لێرەدا بەرپرسیاریەتی بوورژوازی بیرۆکراتی کە خۆی وا دیاردەکات لەقەیرانی مۆدێرینیزمدا کە تادەچێت قووڵتردەبێت، بەتەنها دەتوانێت بە شەڕی چینایەتی توند و بەکۆمەڵکوژی بەهێز رزگاری ببێت، رۆڵی بەرچاوە.
لەهەمانکاتدا بەشی بزاڤی سۆسیالیستی هەڵوەشاوە بچووك نەبینرێت، کە دەیویست بەبێتە سیستەم و رەگەزەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە و پیشەسازیگەرایی مۆدێرینیزمی، بۆ خۆی وەکو ئامانجێکی سەرەکی هەڵبژاردبوو. نەك بەتەنیا دیموکراتی، هەتا گەل کەوەك هەبوونێکی کلتوریە رووبەڕووی مان و نەمان ببوەوە. لەنێوان هەردوو شەڕی جیهانی ماوەی نێوانیشیان، مرۆڤ دەتوانێت وەکو هاربوونی بەدەستخستنی هەژمونگەرایی بەسەر گشتی جیهاندا لەلایەن مۆدێرینیتەی سەرمایەداری بەسێ رەگەزان شرۆڤە بکات. گەلێك نەتەوە، گەل و کلتور هەتا سەر ئێسقان هەرەشەی ئەو هاربوونەیان بینی، ئەوانەی کە دەرفەتی رزگاربوونیشیان بینی، نەیانتوانیوە خۆیان لەخۆ بەزلزانین و تەسلیمبوون بەسیستەمی باڵادەست رزگاربکەن. ئەو ئێنتەرناسیۆناڵەی کە ناتوانێت مۆدێرینیتە تێپەڕێنێت، تاقیکردنەوەکانی بەرەی رەنج و گەل و بەرەی دژە فاشیزم کەدیویست لەساڵانی"1930" پێشییخات، شتێکی ئەو تۆی بۆ دیموکراتی بەدەستنەخست. دیموکراتیەتی لیبراڵیش کە لەدوای شەڕی جیهانی دووەمەوە لەکاتی شەڕی ساردایشدا سەری هەڵدا، دیموکراتیەتی گەلی سۆسیالیزمی بونیادنراویش، لەناوەڕۆکی خۆیاندا نکوڵیکردن بوو لە دیموکراتی. شەڕی هەژموونگەرایی بە بۆیاخی دیموکراتیان بەڕێوەبرد، بەتەنها بابەتێکی تەکتیکی بوو. رووخانی سۆسیالیزمی بونیادنراو، لەراستیدا رووخانی لیبراڵیزمیش بوو. جیهانی دوای ساڵانی"1990"یش بەقەیرانی پێکهاتەی سیستەم تا دەچوو قووڵتر دەبوو و دەئاڵۆزکا، کێشەی دیموکراتی بەهەموو گرانایەکەوە خۆی خستە رۆژەڤەوە. دیموکراتی ویستی خۆی لە گشتی جیهاندا چ وەك ناوەڕۆك و چ وەك رەنگ هەوڵیدا خۆی لەنوێ وە پێناسەبکاتەوە، وەکو مۆدێرینیتەی دیموکراتی خۆی بەسیستەم بکات.
تورکیا لەناو ئەو قۆناخە ئاڵۆزەی جیهاندا، لەلایێك رووبەڕووی کێشەی هەبوون و نەبوون بووەوە، لەلایەکی تریش گەیشتە چانسێك تاکو بتوانێت وەکو کۆمار دەست بە سەرەتایەکی نوێبکات. وەکو کەسایەتیەکی مێژووی کە ئەو سەرەتایەی دروستکرد مستەفا کەمال پاشا، بۆیە دەکرێت هەبوونیان لەگەڵ کۆمار پێکەوە شرۆڤە بکرێت. شیکار کردنی هەردوو هەبوونەکە پێکەوە لەم رۆژگارەشدا هێشتا گرنگی خۆی پاراستووە. مستەفا کەمال کاتێك دەستنیشانی کرد، ئەو خودی خۆی بیرۆکەی کۆماری وەکو رازێك شاردەوەو لەرۆژێکی گونجاویشدا رایگەیاند، لەراستیدا ئەو گرنگیە رادەخاتە پێش. بەقەد پرسیاری ئەوەی"کۆمار لەبەرامبەر چی و چۆن پێکهات؟" پرسیاری" سەرچاوەی خۆی لەکەمە گەردوونی بوونەوە وەردەگرت؟" هێشا لەبۆشای دایەو بێ وەڵام ماوەتەوە. وەکو وشە دیموکراتی بوو یان نا؟ ئەگەر نەبووە بۆ گەیشتنە ئەم رەوشە؟ ئەوانە پرسیاری سەرەکین کە پێویست دەکات راست وەڵام بدرێنەوە. لەرۆژگاری ئەمرۆماندا بەتەواوی تێگەیشتن لە کێشەی دیموکراتی کە هەموو ژیانی تورکیای قوفل کردوە، بەتەنیا دەکرێت بەشیکارکردنی ئەو راستیانەی لەژێر ئەو پرسیارانەدان.
بۆ ئەوەی ئەو بابەتە روون بێتەوە، بەتەنیا لێکۆلینەوە لەسەر مێژووی نزیکی تورکیا بەش ناکا. وەکو ئەوەی لەهەر وڵاتێکیتر یان جیهاندا روویداوە، رەوشی تورکیا و ئەوانەی تریش، بەتەنها بە گرێدان بەشارستانیەتی هەژموونگەرایی ئەوروپا کەبلند دەبێت، دەتوانرێت لێی تێبگەیت. لەم کاتەدا سیستەمی هەژموونگەرا شەپۆلی هەرە بەهێزی جیهانیبوون دەژیا. پێشکەوتنی لەهەر گۆشەیەکی ئەو جیهانە کەدروست دەبن، لەسیستەمی هەژموونگەرا سەربەخۆ لێکۆلینەوەکردنی، ئاشکرایە کە لاوازبێت. رەگەزی دووەم و گرنگیش، ئەو گۆڕانکاریانەی کە تورکیا پیادا تێپەڕدەبوو،

خۆ پەیوەستکردنی بوو بەو دەرکەوتنە رەسەنانەی ئەوروپاوە، لێرەدا زاراوەی هەرە گرنگ ژاکۆبەنیزمە. هەتا بەشێویەکی زۆر ئاشکرا لەو ژاکۆبەنیزمەی لە شۆڕشی فەرەنسادا دەرکەتە مەیدان، بەڵام هەبوونی خۆی لە هەموو شۆڕشەکانی مۆدێرنیزمدا هەستپێکردەوە تێنەگەین، ئەنجامەکانی ژاکۆبەنیزمی گۆشەکانی تری جیهان و لەو نێوەشدا ژاکۆبەنیزمی تورکیا ناتوانین تێبگەین.

پێویستە ئێمە وەهای دابنێین کە ژاکۆبەنیزم وەکو گەردوونیبوونی مۆدێرینێتە تێڕوانینێکی بەدەستخست. لەتێپەڕاندنی نەریتی تیۆکراتی"5000"ساڵەدا مۆری لە شارستانیەتی ناوەندی دابوو، ژاکۆبەنیزم رۆڵێکی ناوەندی بینیوە. وەکو چین نوێنەرایەتی بەشی ناوینی بوورژوازی دەکات کە دەیەوێت ببێتە دەسەڵات. بەشی رادیکاڵی بوورژوازی شۆڕشگێڕە. چ وەك ئایدیالۆژیا و چ وەك چالاکیش گوزارشت لە رادیکاڵیەت دەکات. بۆ خۆی مەرجی دەسەڵاتداریەتی هەرە گونجاو، ئەو وەکو نێوانی داگیرکەریە کە وەکو هێزێکی بیانی دەستنیشانکراوە. هەتاکو دەرفەتێکی داگیرکەری کراوە نەبێت، چانسی بوون بەدەسەڵاتی بوورژواگەرایی ژاکۆبەن ئەوەندەی مرۆڤ بڵێت زۆر کەمە. بەڵام کاتێك بۆ هەموو کۆمەڵگا داگیرکەری کراوە وەکو ماڵوێرانیەك پێشوازیکرا، بۆ ژاکۆبەنیزم رۆژ هەڵدێت. بۆ ئەوەی وەکو دەسەڵاتدار دەرکەوێتە سەر شانۆی مێژوو، ئیتر دەرفەت هەتا دوایی گونجاوە. کۆمەڵگا چاوەڕێی یەکێکەکە رزگاری بکات. مۆنارشیە تیۆکراتیەکان ئەوانەی خاوەنی دەسەڵاتداریەتی باون، بەردەم لێگرتنی داگیرکەری لەلایێك بمێنێت، ئیتر لە رەوشێکدان دەمێکە رۆڵی نۆکەرایەتیان پەسندکردوە. بەرژەوەندیەکانیان تەنیا لەناو هاوکاری بەهێز لەگەڵ هێزە بیانیەکان دەتوانن بیپارێزن. لەبەر ئەوەیە لەناو کۆمەڵگادا لەدەستدانێکی گەورەی رەوابوون دروستبووە. لەم رەوشەدا بەشی هەرە زۆر ئاستی ئایدیۆلۆژی و رێکخستنی گونجاوە، چینی ناوەڕاستە کە لەدەروەی چینی ژووری بەکرێگیراوە. هێزی بوورژوای ژاکۆبەن لەناو ئەو چینانەدا هێزی هەرە گەورەو پەروەردەکراوەو رێکخراوە. پرۆتۆتیپی ژاکۆبەنەکان مرۆڤ دەتوانێت لە شۆڕشی هۆلەنداو بەریتانیادا ببینێت. نمونە لە ساڵانی"1640"دا جرۆمۆڵەکان، یان لە شۆڕشی فەرەنسا هێشتا زووتر، سەرۆکی شۆڕشی ژاکۆبەنی هەرە گەورەیە کە لە بەریتانیا سەری پاشاکەیان لێکردۆتەوە. لەراستیدا شۆڕشی ژاکۆبەن ئەوەنییە کە لەساڵی"1792" لە فەرەنسا پێکهاتووە، بەڵکو ئەو شۆڕشەیە کەلە بەریتانیایە. فەرەنسا کۆپی"ڤێرسیۆن" دووەم یاسێیەمینی ئەم مۆدێلەیەیە.

مرۆڤ دەتوانێت هۆلەندا هەرچەندە بەشێوەیەکی گۆڕاویش بێت، وەکو وڵاتێکی سەرەکی کە ژاکۆبەنیزمی تا دروست بووە شرۆڤە بکات. ژاکۆبەنیزم تەنها کاتێك چینی باوی سەروو کەوتە رەوشێك نەیتوانی بەڕێوەبەرایەتی بکات نا، بەڵکو لەرەوشێکدا کە چینی ژێریش کاتێك بۆ بەڕێوەبردن خاوەنی رێکخستنێکی ئایدیۆلۆژی باش نەبوو، تەڤگەری دەسەڵاتداریە. لەهەرسێ وڵاتاندا کاتێك هەمان هەلومەرج دروست بوون، ژاکۆبەنیزم"رادیکاڵەکانی سەردەمی شۆڕشی فەرەنسا" بەدرووشمی زۆر سەربەخۆگەرا، ئازادیخواز و یەکسانخوازی توند، بە پێشەنگایەتی خۆی بەشێکی زۆری کۆمەڵگا هەڵستێنێتە سەر پێ. سەردەمی مەترسیدار، ئەو سەردەمەیە کە بەشێکی زۆری کۆمەڵگا بۆ دەسەڵاتداریەتی هەڵستێتە سەرپێ. ئەو ساتانەن کە گۆڕانە گەورەکان دەکەونەوە ناو رەحمی دایك. هەموو شتکان تاکو سەر شانیان دەهەژێن. بۆ ئەوەی نوێبوونەوە دروست ببێت ئەو هەژاندنە پێویستە. بۆ فەرەنسا ئەو ساتە مەترسیدارانە لە نیسانی "1792"دا دەستیپێکرد. پاشای بەکرێگیراو بەتەنها لەگەڵ ئارستۆکراتەکانی ئەوروپا بەکرێگیراویەتی لەبەرامبەر شۆڕشی کە لەساڵی"1789" دەستیپێکردوە لەناو جموجۆڵی لە دژی شۆڕش نییە، هەمانکات لەناو راکردنیش دایە. بەشە میانڕەوەکانی چینی ناوین لە ژێرۆندەرەکان"هێڵی راستڕەو لە شۆڕشدا"، لە هاویشتنی هەنگاوی رادیکاڵدا دەترسن. کۆمەنیستە بابووفچیەکانی"یەکێکە لە کۆمەنیستەکانی سەرەتا لە فەرەنسا" ژێرەوەش، لەرەوشێکی زۆر لاوازدانە. دەرفەت بۆ ژاکۆبەنەکان زۆر لەبارە. وەکو دەزانرێت ئیدی ئەو یەکێکە لە هۆکارەکانی تیرۆری هەرە مەزن لەمێژوودا، لە ژێر ئەو هەلومەرجانەدا دەربازی ناو ژیان بوو. لە تەمووزی"1794"دا رێبەری ژاکۆبەن رۆبسپێر دوای ناردنی گیۆتینی، ئەو قۆناخە کۆتای دێت. قۆناخی"1792 - 1794" هەمانکات قۆناخی کۆماری شۆڕشگێڕی یەکەمینە. دوای"1794" بەشێوەی جیاوازیش تێپەڕیبێت، لەناوەڕۆکدا ئەوەی بەدواداچوونی بۆ دەکرێت سیستەمێکی نوێیە. ئەو بەدواداچوونە لە قۆناخی کۆماری پێنجەمینیشدا هەتا رۆژگاری ئەمڕۆش بەردەوامە.

لەشیکارکردنی ژاکۆبەنیزمدا، پێویستە هەندێك رەگەز بە هێڵی ئەستوور دەستنیشان بکرێن. خاڵی یەکەم، بزووتنەوەیەکی کەمینە نییە، بزووتنەوەیەکی جەماوەریە. خاڵی دووەم، هەرچەندە درووشمەکانی ئازادی و یەکسانیش زۆر بەکارهێنرابن، لەڕاستیدا بزووتنەوەی دەسەڵاتداریەتی رادیکاڵی چینی ناوەڕاستە. دەتوانرێت بگووترێت سەردەمی دیکتاتۆریەتیشە. خاڵی سێیەمین، دوای ئەوەی هەڕەشەکانی ناوخۆ و دەرەوە لەبەرامبەر وڵات و کۆمەڵگادا نەمان، بزووتنەوەی ژاکۆبەن کە دەرفەتی مادی لەدەستدا، بەرەو کەوتن چوو. شوێنی خۆی بەگشتی بۆ هێزە راستڕەوەکانی، زۆرکەم بۆ هێزە چەپەکانی بەجێدێڵێت. وەکو لە کۆمۆنەی پاریسی"1870"دا و پێش ئەویش لە هەندێك بزووتنەوەی کە لە "1848"دا لە شۆڕشی هەندێك لە وڵاتاندا دەبینرێت کە ماوەیەکی کەم بەردەوام بوونە.

رەگەزێکی تر کە پێویستە بە ژاکۆبەنیزمەوە پەیوەست بێتە دەستنیشانکردن، کاتێك کە هەستایە سەرپێ خۆی وەکو هەموو نەتەوە"کاتێك چووە دەسەڵات" راگەیاندنی دەوڵەت ـ نەتەوەی نوێیە. ئەو نەتەوەو دەوڵەتگەرای ـ نەتەوەی، لەراستیدا ناو شێوازی نوێی پیرۆز کەوتوونەتە شوێنی پرەنسیبە کۆمەڵایەتیە باوەکان ئەوانەی وەکو گەردوونیبوون، ئەکۆمەنیزم"رۆحگەرایی نێونەتەوەی کریستیانی"، ئومەتگەرایی یە. ئەو نەتەوەو دەوڵەت ـ نەتەوەی تازە راگەێنراوە، ئاینی نوێیە. تێگیشتن لێی لەجیاتی ئاینی کۆن ئاینێکی نوێ دروست دەبێت. بۆ ئەوەی ببنە دەسەڵاتدار مەرجە راگەیاندنیان بە شێوەیەکی پیرۆزی کۆمەڵایەتی. ئەگەر وانەبێت، ئەوا لەلایەن ئومەتی کۆندا لەناو ببردرێن. زۆر بەتوندی دروستبوونی دەوڵەتگەرای ـ نەتەوەی فەرەنسا، بێ سنوور پابەندە بە مەرجی تیرۆرکردنی شۆڕشیشەوە.

تیرۆرکردنی شۆڕش، یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی رادیکالیزمی چینی ناوین. هەندێك جاریش بۆ ئەوەی بتوانێت ببێتە دەسەڵات، پێویستی بەتوندڕەوی و بێڕەحەمبوون دەبینێت. کاتێك چانسی دەسەڵاتداربوونیش نەما، بەشێوەیەکی خێراش بەرەو پاسیفیزم"بێ گاریگەری" چوونیشی لەبەر هەمان هۆکارە. کاتێك ئومێد و مەرجەکانی چوونە دەسەڵات لاوازبوون، ئەو بەشەی بەشێوەیەکی خێرا دەکوژێتەوەو زیاتر رادەستی هێزە راستڕەوەکان دەبێت، دیسان لەناو ژاکۆبەنەکان دەردەکەون. بەشە کەمینەکەشیان هێشتا زیاتر رادیکاڵتر دەبن، یان لەگەڵ کۆمەنیستەکان دەبنە یەك، یان خۆیان دەگۆڕێن بۆ بزووتنەوەیەکی کۆمەنیستی. لە هەموو بزووتنەوە شۆڕشگێڕیەکانی لە ئەوروپا و پێشتریش لە هەموو جیهاندا، مرۆڤ دەتوانێت رووبەڕووی ئەو راستیەبێتەوە. رەگەزێکی تری زۆر گرنگ کە لە راستینەی ئەوروپادا پێویستە روونبکرێتەوە، پەیوەست کردنی فاشیزم و بەلشەفیزمە بە ژاکۆبەنیزم وە. بێگومان ژاکۆبەنیزم لە"1794"دا کۆتای نەهات، هەبوونی خۆی بەردەوام کرد. لە هەموو قۆناخی شۆڕشەکانی دوای خۆی، بە شێوازی گۆڕاو مۆری خۆی لێداوە. خاوەن رۆڵێکی سەرەکی دەسەڵاتگەراو نەتەوگەرای دوو چینی بێ سنورە. نەتەوگەرایەتی ئەڵمان وەکو شێوەی هەرە بێ سنوری نازیزم چەندەی خاوەنی ریشەی ژاکۆبەنبێت، نەتەوەگەرای رووس و بەلشیفیزمیش ئەوەندە ریشەکەی ژاکۆبەنە. ریشەکانی فاشیزمی ئیتالیاش بەشێوەیەکی زۆرکراوە خۆیان دەسپێرنە ژاکۆبەنیزمەوە. نازیزم و فاشیزم " مرۆڤ دەتوانێت هەموو فاشیزمەکانی لەسەر زیادبکات" شێوازی هەرە تیرۆریستی دەسەڵاتداریەتی بوورژوای ژاکۆبەنەکانە کەبۆتە قۆرخکار، بەلشەفیزمیش" لەبەر هەمان شێوە دەتوانرێت پێی بگووترێت" تیرۆریزمی ئەو بەشەی کە بەناوی چینی ژێر بوونە دەسەڵاتدار گوزارە لە هەندێ دەکات. لە هەردووکیشیاندا نەتەوەو دەوڵەتگەرای ـ نەتەوەی، بەشێوەیەکی بێ سنور گوزارەی لێکراوەو ئاوابووە، بەڵام بەناوی چینی جیاجیاوە. بەڵام ناتواندرێت نکۆڵی بکرێت کە ریشەیەکی هاوبەشی ژاکۆبەنیان هەیە. لێرەدا رەگەزی هەرە گرنگ کە پێویستە روونبکرێتەوە، کێشەی لە راستیدا بەلشەفیك تاچەند بوونە کۆمەنیست. من بۆ خۆم لەو باوەڕەدام لەگەڵ هەموو بانگهێشتەکانیشم، ریشەی بەلشەفیکەکان ژاکۆبەنەو نەیانتوانیووە ببنە کۆمەنیست، نەیان توانیووە وەرچەرخانێکی کۆمەنیستی بکەن. لەبەر دەسەڵاتداریەتی و نەتەوەپەرستایەتیە چینیە، رێگا لەبەردەم ئەوە دەکاتەوە کە خۆیان وەك دەوڵەت ـ نەتەوە خەیاڵ بکەن. دەوڵەت ـ نەتەوەش رژێمی دەوڵەتە سەرەکیە سەرمایەداریە کە لەدژی دەرکەوتوون. پێشەنگایەتی کردنیان بۆ پیشەسازگەرایی"ئەندستروبالیزم" کاتێك رێگای دا وەکو مۆدێرێنیستی رادیکاڵ دەربکەونە پێش، لە دواوە شتێك نامێنێت بەناوی شۆڕش. ئەو ئەزموونەی سۆسیالیزمی بونیادنراو لە سەروویانەوە لە یەکێتی سۆڤیەت و چین پیادەکران، ئەو راستیە پشتڕاست دەکاتەوە.

پەیوەندی ژاکۆبەنیزم بە لیبڕالیزمەوە هێشتا زیاتر کراوەیە. ژاکۆبەنیزم وەکو نزیکبوونێکی تیرۆریستی شۆڕشگێڕی لیبڕالیزم رۆڵ دەبینێت. یان وەکو باڵی رادیکاڵی لیبڕالیزمە. پێویستە مرۆڤ وەکو ئاختابووتێك بیر لە لیبڕالیزم بکاتەوە. بەتەنها بە لایەنێك نا، بەڵکو بە زۆر لادا دەجولێتەوە. دوو بزووتنەوە لیبڕالیزمیان نەخستووتە ناوخۆ، تێڕوانینی جیهانی کاسۆلیك و بزووتنەوەی کۆمینالیستی دیموکرات.

تێڕوانینی لیبڕاڵ کە ئایدیالیزم و ماتریالیزمی سۆبژەو ئۆبژەی گۆڕیوەتە ئایدیۆلۆژیای پۆزەتیڤیست بەکاردێنێت، هەژموونگەرایەکی ئایدیۆلۆژیە کە شیکارکردنی زۆر زەحمەتە. لە ئەنارشیستەکانەوە کە تێروانینەکەیان زۆر رادیکاڵە، تاکو جولانەوە رۆژانیەکانی وەکو فەمێنیست و ژینگەپارێز، تێڕوانینی زۆر جیاواز دەردەبڕن و شێوازی ژیانیان لەناو خۆیاندا دەتوێنێتەوە، ئەو راستیە دەسلمێنێت کە هەژمونگەرایی ئایدیۆلۆژی لیبڕالیست سەرچاوەی هێزی سەرمایەداریە.

بەوشێوەیە پێویستی بوونی تورکیایەکی مۆدێرێن لەناو پەیوەست بوون بەڕاستی جیهانی و ژاکۆبەنیەکانی سەرمایەداری شیکارکردن، جارێکی تر روون دەبێتەوە. ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە بەرامبەر سەرمایەداری ساڵانی"1870" دەربازی قۆناخی ئیمپریالیستی قۆرخکاربوو، بە کۆنفرانسی بەرلینی ساڵی"1878"دا هێشتا زیاتر کەوتە قۆناخی پەلهاویشتن. نزیکبوونە دەوڵەتگەرا ـ نەتەوەی، لەناوخۆ و دەرەوە دەزگاکانی ئیمپراتۆریەتی باو و کۆنەکانی دەهەژاند. تەدبیرەکانی ریفۆرمی وەرگیرابوون بەکاریگەر نەدەبوون. رزگارکردنی ئیمپراتۆریەت ئامانجی سەرەکی بوون. ئەو نزیکبوونانەی کەوەکو بزووتنەوەی ژۆنتورك"تورکی گەنج" بەناوکرابوو، تێڕوانینی باڵێکی ئەوروپابوو بەڕێبەرایەتی مازینی کە خۆی لەناو ئیمپراتوریەتدا دەردەخست. وەکو باڵی نەتەوەپەرستی ژاکۆبەنیزم شێوەی خۆی گرتبوو.

یەکێك لەو مەیلانەش مەیلی ئیتیحاد و تەرەقیە کە وەکو مللیگەرای عوسمانیش دەتوانرێت هەڵسەنگێنرێت، لایەنی تایبەتی سەرەنج راکێشە. تایبەتمەندی یەکەم، مەیلێکە یان جولانەوێکە کە نەلەناو کۆمەڵگادا، لەناو دەوڵەتدا خۆی بەڕێکخستنکردوە. تایبەتمەندی دووەمین و گرنگیش، لەسەرتاوە بەشێوەی نەتەوەپەرستی دەوڵەت خۆی بەڕێکخستنکردوە. سێیەمین تایبەتمەندی، بەدەستی دەوڵەتی سەرمایەدارو بوورژوازی وەرچەرخان دەکات. ئەو سێ تایبەتمەندیانە، کارەکتەری راستڕەوی فاشیستی ئیتیحادو تەرەقی دیاریدەکەن. لەبەرامبەر ئەوەی کە نازیزمی ئەڵمانیا و فاشیەتی ئیتالیاش وەکو بزووتنەوەیەکی جەماوەری دەستیان پێکرد و دواتر وەکو دەوڵەت خۆیان بەڕێکخستن کرد، بەهەموو لایەنەکانیەوە ئیتیحاد و تەرەقی لەناو دەوڵەتدا ئاوابوونی، کاراکتەری فاشیستی رەگەزپەرستی هەرە کۆنەپەرستی ژاکۆبەنیزم، هەتا لە راستیدا دەردەکەوێت کە لە ژاکۆبەنیاندا دەرکەوتووە نیشاندەدات. ئەوە نیشاندەدات کە رێکخستنێکە هاوتەرییە لەناو دەوڵەتدا، لەگەڵ دەوڵەتدا وەکو رێکخستنی دەوڵەت خۆی بەڕێکخستن دەکات. بەگوێرەی دەوڵەتی باو، نەوەکو دەوڵەتێکی پێشکەوتوو، دروستبوونی وەکو دەوڵەتێکی فاشیست نیشاندەدات. بەو حاڵەی نمونەی سەرەتای راستیەکە. دوای ئەوەش هیتلەر ئەوەی بۆ خۆی وەکو مۆدێلێك بەبنەما گرت، ئەوەش لەخۆڕا نییە. مۆدێلێکی تازەیە لەناو دەوڵەتدا دەوڵەتبوون.

لەوەش سەرنجڕاکێشتر، لەناو دەوڵەتدا بەدەستی دەوڵەت، ئاواکردنی نەتەوەپەرستیە. لەگەڵ ئەوەی کە هەر چوار

دامەزرێنەری سەرەتای ئەم رێکخستنە بە ریشە تورکیش نین، بەرەو ئاواکردنی نەتەوەی پرۆتو ـ تورك، زانیاریەکی سەرەتایە بۆ سەختگیربوونی کێشەی دیموکراتی. ئاواکردنی دەوڵەت و نەتەوە لەناویەکتریدا، لەسەرتاوە پێچەوانەی دەوڵەتی باو، راستینەی سۆسیۆلۆژیایە"زانستی کۆمەڵناسی". بەتەواوی لە ژوورەوە هاتۆتە دروستکردن. یەکێکی تریش لە تایبەتمەندی دیاری کاراکتەری فاشیست، بەو شێوەیە دەردەکەوێتە مەیدان. لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا، چوون بەرەو کۆمیتەگەرایی جەمعیەت، بەواتایەکی تریش شەڕی ناوخۆیە. لەناو دەوڵەتدا بەڕێوەبردنی شەڕی ناوخۆ، مرۆڤ دەتوانێت بە کۆمیتەگەرایی چەکداری ساڵی"1906"دا دەستپێبکات. لەناو دەوڵەتیشدا بەڕێوەچوونی شەڕی ناوخۆ، نمونەیەکی سەرنجراکێش و دیارە. ئەو هەنگاوە کە سەرەتا بۆ کودەتاکردن وەکو مۆدێل بەدەستیانگرتبوو، وابکات کە دیموکراتیەتی بە شێوازی رۆژئاواش بێ دەرفەت بێت.
وەکو کاکڵی نافەرمی بەکارهێنانی دەوڵەتی فەرمی، بەواتای زۆرترین بنپێکردنی بنەماکانی دیموکراتی دێت. خراپتریش لەوە دەوڵەت لەدەوڵەتبوون دەردەخسترێت. وەسفی هەرە بەرچاوی دەوڵەت فەرمیەتەکەی و بەیاسا بەڕێوەبردنی کۆمەڵگایە. لەگەڵ هەموو کەموکورتیەکانیشی، نەریتی بەڕێوەبردنی دەوڵەت لەلایەن سوڵتانە عوسمانیەکان لەبەرچاوانە. ئەگەر ئەخلاقەکەیان دیاریشەو خاوەنی کاراکتەرێکی ئاینیشبن، یاسای تایبەت بەخۆیان هەبوون. بەدەستگرتنی هەندێك تاکتیکی پیلانگێڕی، ناوە بەناوە، ئەویش لەئەنجامی هەندێك نزیکایەتی شەخسیەوە دروست دەبوون. شێوازی بەڕێوەبردنی چ دەوڵەت و چ کۆمەڵگا لەلایەن ئیتیحاد و تەرەقی، لەسەرەتا هەتا دوایی خاوەن تایبەتمەندی پیلانگێڕی و کودەتابوو. دەرکەوتن لە دەوڵەتبوون گوزارە لەم راستیەدەکات. لەبەشداربوونی شەڕی جیهانیشدا ئەو راستیە بەراشکاوی لەبەرچاوە. کاتێك مرۆڤ بەقووڵی سەیری بکات، بەشێوازی لەڕێگا لادراو بۆتە فاشیست، لەڕاستیدا دەوڵەت رزگارناکرێت، پاکتاودەکرێت. چەتەگەرایەتی دەوڵەت، بەواتای لەناوبردنی دێت. مەشرووتیەتی یەکەم و دووەم لەگەڵ هەموو نیازێکی پاکیشیان، پێچەوانەی ئامانجەکانیان پشتگیری دایە دژ ـ مەشرووتیەتگەرایی، دەوڵەتێکی چەتەگەر یانیش بێ دەوڵەتی. چەتەگەری بیرۆکراتی دەوڵەتی نوێی خستۆتە ناو شێوازێك کە بەدوای کۆندا بگەڕێت.
هەڵوەشانەوەی فاشیزمی ئەڵمانی کە لە ساڵی"1945"دا روویدا، بەناوی تورکەوە فاشیزمی ئیتیحاد و تەرەقی لە ساڵی "1918" دا پیادا دەربازبووە. وەکوتر نەدەکرا. دەوڵەت بەچەتەبوونی ناوخۆیدا ماوەیەك پێش ئەوە لەناو هەڵوەشانەوەدابوو. لەساڵی"1918" لەئەنادۆڵی ناوین و میزۆپۆتامیادا بەتەنها دەوڵەت نا، کۆمەڵگاش رووبەڕووی داگیرکاریەکی کراوە ببوو. قەیرانی دەوڵەت و دیموکراتی بە شێوەیەکی زۆر قووڵ ژیاندەکرا. لەبەرامبەر ئەمەدا، ئەو ئامرازە پاشکەوتووانەی دەوڵەت و هێزەکانی کۆمەڵگاش هیچ چارەیەکی تریان نەبوو دەرەوەی دەربازبوون بۆ رەوشی پاراستنی بنەرەتی. لەبەرامبەر ئەمەدا وێنەی رێبەرایەتی مستەفا کەمال کراوەیە کە تایبەتمەندی ژاکۆبەن وەبیر مرۆڤ دێنێتەوە. داگیرکەری کراوە هەنگاو بەهەنگاو پێشدەکەوێت. بەشی باڵادەست لە بەڕێوەبەرایەتی باودا، ماوەێك بوو لەگەڵ هێزە بیانیەکان کەوتبووە ناو رێکەوتن. ئاستی رێبەرایەتی بزووتنەوەی کۆمەنیست زۆر لاواز و هەتا نییە. ئەوەی دەمێنێتەوە بەناوی توێژی ناوەڕاست کە زۆر رادیکاڵ و رێکخراوە، چانسی ئەوەی دەبێت کە بەناوی هەموو کۆمەڵگاوە بکەوێتە جموجۆڵەوە. مستەفا کەمال چ وەك کەسایەتی لەبەر پێویستی شێوازی گەورەبوونی، چ وەك ژێری تایبەت و ئیرادەش وەکو جل و بەرگ یان بڵێین وەکو لێخورێکی گونجاو بوو بۆ ئەو هەلومەرجانە. وەکوتر باش زانینی زمانی فەرەنسی، باش تێگەیشتن لە فەرەنسا کە کۆماری سێیەمین پرەنسیبەکانی ژاکۆبەنیزمی پەسندکردوە، ئاسانکاری بۆ دروستکردوە. لە کۆمارگەریەتی ژاکۆبەن باش تێگەیشتووە. لەلایەنی رێکخستنیەوە خاوەن ئاستێکی گرنگە. چ لەبەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی ئیتیحاد و تەرەقی بوون بە بەرهەڵستکار، چ ئەوکاتەی ئەو بەڕێوەبەرایەتیە هەڵوەشایەوە، لەگەڵ گرووپەکەیدا یەکگرتنێکی دروستکرد، ئەمەش بۆ بەڕێوەبەرایەتی ژاکۆبەنیك بۆتە پشتیوانیەکی گەورە. ئەوەی دەمێنێتەوە تێپەڕاندنی ئاستی رێبەرایەتی کردنی کرداریە.
ساڵی"1919" دەزانرێت مستەفا کەمال چۆن دەستی بە رێبەرایەتی کرداری کردوە. لێرەدا پرسیارێکی سەرەکی کە پێویستە پرسیاربکرێت، چۆن فەرمانداریەتی داگیرکەری ئینگلیز و سوڵتان واحدەتین تێپەڕاندوە، لێرەدا دەبێت پرسیار. وەڵامی ئەو پرسیارە کە دەبێتە بابەتی زۆرێك لە گفتوگۆ ئاڵۆزەکان، لەگەڵ تێپەڕبوون بۆ رێبەرایەتی کرداری ئیتر گرنگی خۆی لەدەستدەدات. قۆناخی دوای ساڵی"1920" کە بەراگەیاندنی پەرلەمان دەستپێکرد، لە راستیدا لە دژایەتی کردنی داگیرکەری زیاتر، گوزارشت لە شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی دەکات. ناوەڕۆکی پەرلەمان و ئامانجەکانی ئەوانە دەسەلمێنێت. رەگەزی هەرە گرنگ کە پێویستە دەستنیشانبکرێت، لەم شۆڕشەدا رۆڵی سەرەکی هێزە بڵاوبووەکانی دەوڵەتنین بەڵکو کۆمەڵگا رۆڵی گێراوە. ئەگەر هێزەکانی کۆمەڵگا پشتیوانیان نەکردبوایە ئامرازەکانی دەوڵەت لەناو نەخۆشی و بڵاوبوونەوەیەکی قووڵ دابوون، نەیان دەتوانی بزووتنەوەی شۆڕشگێر بەڕێوەببەن. مستەفا کەمال کە زۆر باش لەو رەوشە تێگەیشتبوو، بە پێداگریەوە پەرلەمان وەکو یەکەمین سەرچاوە نیشاندەدات، ئەمەش جێگای حاڵی بوونە. هەرچەندە پەرلەمان لە ئاستێکی وا قووڵیشدا نەبێت، لە هەلومەرجەکانی شۆڕش تێگەیشتووە. نوێنەرایەتی زۆربەی هێزەکانی کۆمەڵگا دەکات. تایبەتمەندیە دیموکراتیەکانی سەرەتای پەرلەمان کراوەن. بە پێکهاتەکانی ئاینی، نەتەوەیی و چینی، بەبنەما گرتنی سنورەکانی میساقی میللی بۆ خۆی، ئاستەکەی دیاری دەکات. هەتا دوایی لەبەرامبەر داگیرکاری دەردەکەوێت. ناوەڕۆکی ئاینی و کۆمەڵایەتی لە ناوەڕۆکی میللی لە پێشترە. تورك و کوردی ئیسلام، هێزی سەرەکی کۆمەڵگان. لە بەرامبەر کۆمەنیزم دوژمن نییە. لە شەخسی لینین دا لەگەڵ ئەنتەر ناسیۆنالیزمی کۆمەنیستدا، لەناو دۆستایەتیدایە. مۆری چینی ناوەڕاستی لەسەر هەیە. بەشێکی گرنگ لە بیرۆکراسی و ئەشرافیش لەو چینەن، ئەو بزووتنەوەی بۆ کێشەکانی مان و نەمان وەکو چارەسەری دەبینن. ئەگەر هێشتا زیاتر روون بکەینەوە، ئەو هێزانەی کە لە پەرلەمانی تورکیادا رێکەوتنیان دروستبووە، وەکو ئایدیۆلۆژی نەتەوەپەرستی تورکی عەلمانی کە ریشەکەیان چینی

ناوەڕاستە، وەکو ئومەتەپەرستی ئیسلامی لە دەوروبەری خێڵەکانی کە ڕێبەرەکانیان تورك و کوردن، لە توێژی ژێر و سۆسیالیستن کە حەز لە بەلشەفیك بوون دەکەن. هەرچەندە دیاریش نەبێت، ئەو ڕەوتە و نوێنەرایەتیەکەیان لە هەلومەرجی داگیرکەری کراوەدا، وەکو هێزی کۆمەڵگا کەوتوونەتە جموجۆڵ.
ڕێبەرایەتی مستەفا کەمال هەرچەندە خەریکردنێکی پێویستیش بکات، بەڵام پەسندکراوە. بەسەنگەرگرتنی هێزەکانی کۆمەڵگا ڕێگای لە داگیرکردنی کراوە گرتووە. ساڵەکانی نێوان"1920- 1924" قۆناخی شۆڕش کە لایەنی توندوتیژی و سەربازی زیاترە. وەکو قۆناخی ژاکۆبەنێك بەسەرکەوتووی تێپەڕیووە. ئەوکاتە بۆ لایەنی دیموکراتیزەبوون دەرفەتێکی گرنگی پێشخستووە. لەگەڵ ڕاگەیاندنی کۆمار لە ساڵی"1923"دا، ئەو دەرفەتە بەردەوام بووە. بەڵام بە دەستووری"1924"، زۆر کەوتنە دواوەی دەستوری"1921"، بە هەڵبژاردنی"1923" فشاری هەمەلایەنی لە پەرلەمانی تورکیادا، بەبیانووی سەرهەلدانی کوردان لە"1925"دا کورد لەدەرەوە هێشتن، ئەو دەرفەتە مێژوویە بەرەواژوو کراوەتەوە، مەیلی سیستەمی یەك پارتی باڵادەست دروستبووە.
بۆچی و چۆن دەربازی ئەم قۆناخە بوونە، بابەتێکی ڕۆژەڤی گرنگە کە هێشتاش گفتوگۆیەکانی بەردەوام دەکات. بەڵام لە ئەنجامدا لە کانوونی"1921"دا بە پیلانگێریەك کوشتنی پێشەنگەکانی پارتی کۆمەنیستی تورکیا"TKP" مستەفا سەبحی و کادیرە پێشەنگەکانیان، ئەو دوورخستنەوەی سەعید نەورسی و محمەد عاکف کە دوو کەسایەتی گرنگی بزووتنەوەی ئیسلامین لە ساڵی"1923"دا ڕوویدا، پیلانگێر و ئاژاوەگێڕی کە لە سەرهەلدانی کوردان لە ساڵی "1925"دا ڕوویدا، هۆکارو هێزەکانی لەپشتیدا هەرچی دەبێ کێشە نییە، بەکراوەی دەیسەلمێنێت کە ڕێکەوتنی دیموکراتی تێکچووە و قۆناخی باڵادەستی بەبنەما وەرگیردراوە. لە هەڵسەنگاندنی قۆناخی باڵادەستیدا مستەفا کەمال بەرپرسیار گرتن، ئەوا ڕێگا لەبەر نەبینینی هۆکارە سەرەکیەکان بکاتەوە. مستەفا کەمال ڕۆڵی خۆی مێژووی لە ڕووبەڕووبوونەوەی داگیرکاری و ڕاگەیاندنی کۆماردا، لە ئاستی پێویستدا گێراویەتی. بەڵام نەیتوانیوە ڕێکەوتنی دیموکراتیانەی کۆمار بپارێزێت و ڕێگا لە خرابوونی بگرێت. لێرەدا هۆکارەکانی ناوخۆ و دەرەوە، ڕۆڵی زۆر لە کەسایەتیەکان لە ئاستی ژۆردا بە کاریگەربووە.
لەناوخۆدا ئەوانەی سەرهەلدانی کورد ورووژاندن و بەکرێگیراوەکانی سەڵتەنەت، بۆ لە دەرەوە هێشتنەوەی کوردان ڕۆڵێکی گرنگی بینیوون. لە ڕاستیشدا ئەو دەنگدانە شاراوەی کە لە ساڵی"1922" لە پەرلەمانی تورکیادا پێکهاتووە، بە"373" دەنگی ئەرێ و بەدژایەتی "63"دەنگ نا، بڕیاری دامەزراندنی ئەنجوومەنێك کە خۆی دەسپێرێتە خۆبەڕێوەبردن بۆ کورد هاتبووە پەسندکردن. لە سەرەتای ساڵی"1924"دا مستەفا کەمال، بەو لێدوانانەی کە خۆی ڕایگەیاندون، باسی پرۆژەی چارەسەری کردوە کە بەواتایەکیتر بەواتای خۆبەڕێوەبردنی دیموکراتی دێت بۆ کوردان.
لەدەرەوە هێشتنەوەی کورد لە بڕیاری پاکتاوکردنی ئەتنیکی مستەفا کەمال زیاتر، پەیوەستە بە ئاژاوەگێڕی بەریتانیا کە لەگەڵ لایەنگرانی سەڵتەنتدا بە میساقی میللیشەوە بۆ ئەوەی موسڵ و کەرکوك لەدەرەوە بهێشترێنەوە پێشخرابوو. بەشێوەیەکی کراوە ئەمە کراوە: ئەوەی لەبەرامبەر موسڵ و کەرکوك ـ وەکو ئەوەی لەبەرامبەر ڕۆم و ئەرمەنیان هاتۆتەکردن ـ بەرەو ڕێکەوتنێکی پاکتاوکاری چوونە. کۆمار لەبەرامبەر چی سازشی لەگەڵ ئیمپراتوریەتی بەریتانی کردوە کە لە بەرامبەرایدا شەڕی سەربەخۆی بەڕێوەبردبوو، کوردی خستۆتە دەرەوەی سیستەم؟ ئەمەش لە هەڵەیەکی مێژووی زیاتر، پەیوەستی داخوازیەکە. وا بیردەکەنەوە کە ئیتر پێویستی بە ڕێکەوتن لەگەڵ کوردا نەماوە. وەکوتر لە پشتیوانی کردنی ئینگلیز بۆ کورد دەترسێن. ئەو ڕێکەوتنەی کە دروستبووە، لە هاوپەیمانیەتیەك دەچێت لەگەڵ یۆنانیان، ڕووس و فەرەنسیان کەدروستبووە. لەم ڕەوشەدا هێشتا لە دە ساڵ پێش دامەزراندنی کۆمار، هەنگاوی هەرە گرنگ لەدژی دیموکراتی هاویشتراوە، یەکیش لەوانە سەبارەت بە کوردە. ئەنجامی ئەمەش ئازار، قوربانی مادی و بەردەوام کۆمار لەلایەنی دژ ـ دیموکراتی بێت و ئەمەش دەرکەوتووە کە تا ڕۆژی ئەمڕۆ بەردەوام دەکات.
خراپکردنی ڕێکەوتن لەگەڵ ئومەتی ئیسلامیش هەنگاوی دووەمینی گرنگی دژە ـ دیموکراتیە. هەرچەندە لەژێر ناوی عەلمانیەتدا، لە بەرامبەر ئومەتی ئیسلام بەردەوام کامپینێکی ئایدیۆلۆژی و پراکتیکی هەبێت و کێشە وەکو کۆنەپەرستی ـ پێشکەوتنخوازی دیاری بکرێن، ئەوەی کەوا جێبەجێکرا هەوڵدانی باڵادەستکردنی سیستەمبوو. چەمك و کۆمەڵگای ئومەتی ئیسلام خستنە ژێر حاکمیەتەوە ئەوەش گرانایەکی کۆمەڵگای سەردەستبوو، ئەمەش کەوتنە ناوی هەنگاوی بە ئەنقەستی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییوو. لەمەشدا لەپێشەوە ئیمپراتوریەتی بەریتانیا، ڕۆڵی هێزەکانی ئەوروپا لەپێشەو گرنگە. ئەو هەوڵدانەش بە پەسندکردنی ئەوانەوە دروستبووە. کۆماری تورکیای نوێ، لە ناوەو لە دەرەوە لە ئومەتی ئیسلام دابڕاندن، وەکو ئامانجێکی ستراتیژی بینراوەو لەو لایەنەوە هەڵوێست هاتۆتە پیشاندان و هەوڵی بۆ دراوە.
نوێنەری بەشی کرێکارانیش، هەر لە سەرەتاوە پێویست بوو لە دەرەوەی سیستەم بەدەستبگیردرێن. نە بەتەنها بەکوشتنی مستەفا سوبحی و ئەوان، بەردەوام قەدەخکردن و گرتنیان، لەبەر هەوڵدانەکانی لە دەرەوە هێشتنەوەی سیستەم دەردەکەوتە ڕوو.
هەژموونگەرایی بوورژوا کە دەیانوویست خۆیان لە ژێر باڵی پاراستنی کۆماردا دروستبکەن، بابەتی گفتوگۆکردن بوو. بە بەکارهێنانی ڕێکەوتنە ستراتیژیەکانیان، لە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری مۆڵەتی دەسەڵاتداریتیەکی ژێر دەستی خۆیان وەرگرت. دەوڵەتی نوێ کە بەکۆنگرەی ئابووری ئەزمیر، کە هێشتا لە کاتی ڕاگەیاندنی کۆماردا هەوڵدانی لەگەڵ سەرمایەداری بەشێوەیەکی ئاشکرا نیشانداوە، لە گەڵ شۆڕشی مەدەنی هەوڵدانی خۆی بۆ مۆدێرنیتە خستۆتە ڕوو، هاوپەیمانەکانی لەدەرەوەی سیستەم هێشتەوە، بەشێوەیەکی کراوە ئاماژەکانی بەلایەنی شارستانیەتی ڕۆژئاوا جێبەجێکرد، جێگای گفتوگۆیە. لێرەدا لە کەسایەتی مستەفا کەمال زیاتر، چەمکی هەلومەرجی ئەوکات و ژێرخانەکەی یارمەتیدەرە. ئەو کۆمارەی ڕاگەێنراوە بەڕێوەی بردوون، ئەوەیش بەدۆستایەتی ئیمپراتوریەتی بەریتانیا تێدەپەڕی. هەرچەندە لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی لەمۆسکۆشەوە هاوپەیمانیەتیەکی دۆستایەتیش هەبێت، دۆستایەتی سەرەکی لەگەڵ

بەرەی بەریتانیادا بووە.

ئەو لایەنەی کە مۆری لە سیاسەتی دەرەوەی مستەفا کەمالیشداوە ئەمەیە. کاتێك ئێمە راستینەی مستەفا کەمال دێنینە بەرچاو، تێگەیشتن لەوەی رووداوەدات و ژیان دەبێت زۆر سەخت نییە. بەشێوەیەکی کراوە کۆمار بەتەنها دەیتوانی بە رێکەوتن لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی بەریتانیدا بەرێوەبچێت و هەرواش کراوە. پێکهاتێکی سیاسی بەتەواوی لەگەڵ سیاسەتی بەریتانیا لەو کاتەدا رێکدەکەوێت، ئەمەش جێی گفتوگۆیە. رێگا دراوە کە کۆمار ببێتە دەوڵەت ـ نەتەوەێك، لەبەرامبەر ئەمەدا کورد، ئیسلام و سۆسیالیست لەدەروە هێشترانەوە. ئەو رێکەوتنە لەگەڵ سیاسەتی بەریتانیا نەبووایە، کۆمار هاوپەیمانە سەرەکیەکانی خۆی لەدەست نەدەدا. لەهەوڵدانی دەوڵەت ـ نەتەوەدا چوون بەرەوە چاخی رژێمە کۆنژۆنکتوورەل"تەنها سیاسی"، دەسترۆ و فاشیست بەکاریگەربووە. بەتاییەتی دوای ساڵانی"1930" ئەو هەوڵدانانە هێشتا زیاتر خاوەن رۆڵن. ماوەیەکی زۆرە هەوڵدانی کۆمار بەشێوەیەکی ئاشکرا بەلایەنی شارستانیەتی رۆژئاوادا دروستبووە. هەوڵدان بەرەو سۆڤیەت و سەرلەنوێ گەرانەوە بەرەو شارستانیەتی ئیسلامی هیچ کاتێك نەیان هێناوەتە رۆژەڤی خۆیان.

لە کۆماری تورکیادا، بەرێوەبردنی دەوڵەت ـ نەتەوە بە نەتەوەپەرستیەکی بێسنوور، لەهەر جۆرە هەنگاوێکی دیموکراتی زیاتر گرنگتر بینراوە. وەکو باوەردەکرێت، مستەفا کەمال لەم ئەزموونەدا لە پێشی پێشەوە نییە. ئەزموونی "فرقەی سەربەست" لە ساڵانی "1930"دا، بەفوولی پەیوەندی بە لێکۆلینەوەکانی سەبارەت بە سومەر و هیتیتیەکانە، پیشاندەدات کە لەناو بەدواداچوونێکی وڵاتپارێز و دیموکرات و رەگەزپەرستدا نییەو پشت دەبەستێت بە دەوڵەمەندی کلتوری ئەنادۆڵ. بەردەوامکردنی بەرنامەی دەوڵەت ـ نەتەوە بەهەموو بێسنووری و خێرایەکەی، پەیوەستە بەهێزی باوی ئێتیحادگەراکان. لە دەرەوەی مستەفا کەمال کەسێکی تر کە لەبەرامبەر ئەو نەریتە باوە تێکۆشان بکات نییە. پێچەوانە سەرەتا عیسمەت ئینۆنوو، فەوزی چەکماك و کازم کەرەبەکر، بەشێکی زۆر لە بیرۆکراسیەتی سوپا و مەدەنیش کە لە پێشەوەن، ریشەکەیان ئێتیحاد و تەرەقیە، بەتوندی هەڵگری رێبازی ئەو نەریتە باوەبوون. ئەوەی گۆردرابوو تەنها لە لاینگرایەتی بۆ ئەلمانیا چوونبوو بەرەو لاینگرایەتی بۆ ئینگلیز. ئەوەی دوای لێدانی بە مرامی کوشتن"سیوکاس"ی ئەزمیر دروستبووە، پیشاندەدات کە مستەفا کەمال لەژێر گۆشەگیریەکی توند دایە. مستەفا کەمال لە ساڵەکانی "1926 ـ 1927"دا، لە رەوشێکی وادایە لەناو چەرخ و فەلەکی بیرۆکراسیەت لە چەنکایەدا کلیل دراوە. کاتێك دەگوترێت نەحکومی کەسایەتیان بەڵکو حکومی کۆنژەکتۆران جێبەجێدەکرێت، ویستراوە گرنگی ئەو راستیە دەستنیشانبکرێت. ئەو بزووتنەوە سەهیۆنیستیەی کەبە ئیمپراتۆریەتی بەریتانیاوە پەیوەستکراوە، پێشنیاریان تاکو دروستکردنی ئیسرائیل لەساڵی"1947"دا، تورکیای نوێ وەکو وڵاتێکی سەرەکی لەو قۆناخەدایە، پێویستە مرۆڤ بەهەندی وەربگرێت.

بەکورتی سەردەمی کۆمار تاکو مردنی مستەفا کەمال، لەناو پێکهاتەیەکی ئایدیۆلۆژی و هەڵسوکەوتی باوی ئێتیحادگەرای دەوڵەت ـ نەتەوەی توند و بێ سنور ئەوانەی دژ ـ دیموکراتی بەرێوەچووە. سەرەرای ئەوەی لەسەرەتاشدا بینراوە، پێشکەوتنی سەرمایەداری دەوڵەتی و پیشەسازیگەرایی سنوردارماوە. مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کە پێ دەگووترێت شارستانیەتی رۆژئاوای سەردەم، باڵادەستی خۆی تەنها بەرژێمێکی یەك پارتی دەسەڵاتگەرادا بەرێوەبردوە. کێشەی دیموکراتی هەتا ئاستێکی بەرز سەختبووە. دوای شەری جیهانی دووەم پەیوەست بەبلند بوونی هێزی هەژمونگەرای نوێی سیستەمەی ئەمریکاوە، بەدەرکەوتنی پارتی دیموکرات"DP" لەساڵانی"1945 ـ 1950"دا وەك تەقینەوەیەك بوو. ئەوەی بەهاتنی پارتی دیموکرات زیادبووە لەسەر سیستەم، بەشێکە لەدەوروبەری ئیسلامی. ئەو رووداوەی پێی دەگووترێت لە عەلمانیەتدا پاشکەوتن دروستبووە، لەناوەرۆکدا کەمبوونەوەی بەشی بورژوازی بیرۆکراتیە ئەوەی لەناو مشەخۆری دەوڵەتدایە. تێکۆشانی مشەخۆری لە رێگای عەلمانیەتەوە بەرێوەدەبن.

ئەو چەپگەرایەتیەی کە چەوسێنراوەتەوەش دەیەوێت لەم قۆناخەدە بکەوێتەوە جموجۆڵ. جولانەوەی کوردی هێشتا لەناو هەنگاوهاوێشتنێکی لاوازدایە. سێ جولانەوە دیموکراتیەکە کە فاشیزمی ئێتیحادگەرایی چەوساندونیەتەوە بەنۆرە دەیانەوێت زیندووببنەوە، کۆماری تورکیا لەژێر هەژمونگەرایی ئەمریکادا کەوتوتە پەیمانی ناتۆش، لەپارستنی ئینگلتەراوە دەربازی پاراستنی ئەمریکا دەبێت. ئەمریکا ئەو پاراستنە بە پێکهێنانی گلادیۆوە دروستدەکات. لەنێوان ساڵانی"1950 ـ 2007"دا هەموو پێکهاتەکانی سوپا ـ سیاسەت لەژێر چاودێری گلادیۆوە کاردەکات. تێگەیشتن لەدەرەوەی قۆناخی ژاکۆبانیکی لە ساڵانی "1920 ـ 1922"دا، هەموو قۆناخەکە لەژێر کۆنترۆڵی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریەوە پێشکەوتووە، بۆ کێشەی دیموکراتی گرنگە. سەربەخۆی خەیاڵی بوورژوازی بچوکەو ئەو گوزارشت لە راستی ناکات. لەبەر ئەو سیستەمەی کە مۆدێرینیتەی سەرمایەداری هەژمونگەرایی جیهانی خۆی تیا دروستکردوە، هیچ وڵات و دەوڵەتێك سەربەخۆنابن. کۆماری تورکیا لەبەر تایبەتبوونی ئەنادۆڵی، ئەو دەوڵەتەی کە تائاستێکی بەرز لەناو تۆری گرێداندایە بەسیستەمەوە.

دامەزراوەی گلادیۆ کە دوای شەری سارد گرنگی نەماوە، لەبەرهۆکاری"PKK" هەتا ساڵی"2007" لەتورکیا بەکاریگەر بووە. گلادیۆی ناتۆ لە تورکیا لە ژێر ناوی جیاجیا کاروبارەکانی بەرێوەدەبات، لە نەمانی بوورژواشدا چانس ناداتە دیموکراتیەت. کۆماری تورکیا لە نێوان ساڵانی"1925ـ 1990"دا، هەتاکو هەڵوەشانەوەی سۆڤیەت خاوەن رۆڵی دژە ـ سۆڤیەت بوو، دوای ساڵانی"1990" پێویست بوو کە لەمۆدێرینیتەبوونی نەریتی باوی ئیسلامدا وەکو وڵاتێکی مۆدێل بەکاربهێنرێت. لەوەندە بەکارهێنانی کۆماری تورکیادا رۆڵێکی گەورەی پێکهاتەی کۆمیتەبوونی ـ کودەتاچی لەناو دەوڵەتدا هەیە. بەکارهێنانی بەرە جیاجیاکان لە بەرامبەر یەکتری، دەرفەتێکی وا دروستدکات. شەری چەتەکان لەناو دەوڵەتدا، کێشە کۆمەڵایەتیەکان ئەوەندەی دەزانرێت زیاتریان سەختگیرتر دەکات. بزووتنەوەیەکی دیموکراتیش ئەگەر دەربکەوێت، وەکو پاشکۆی خۆی هەڵی دەسنگێنێت، بچوکترین جموجۆڵی دیموکراتیش لەناو دەبات.

واتای تورکیا بۆ شارستانیەتی رۆژئاوا، بەتەنها سنوردارە بەپشتگیری بۆ ئاسایشەکەی و هێزی بازاڕی هەرزان بەهای پێشکەش دەکات. شەڕی کۆماری تورکیا لەگەڵ"PKK"، هەر بەتەنها سیاسەتی سیستەمی روون نەکردەوە، بەڵکو ئەوەشی سەلماند ناکۆکی"PKK" لەگەڵ سیستەم هەیە. حاڵیبووین کە جیابوونەوەی کورد تورك لەیەکتری نابێتە ئامانج. نیشانیدا کە راستەقینەترین تێکۆشانی دیموکراتی لە تورکیا، بۆ جاری یەکەمە کە راسینەی سیستەمی سەردەستیش لەو لایەنەوە ئاشکرابووە، شێوەیەکی رادیکاڵی وەرگرتووە. هەوڵدان بۆ تێگەیشتنی راستینەی شەڕی"PKK" لەگەڵ کۆمار نییە، پەیوەندی بە دژە ـ دیموکراتیەوە هەیە، ئەمەش گرنگیەکی زۆری هەیە. لە بەرامبەر تەنگەتاوبوون لە دەوڵەت ـ نەتەوەێك، دەوڵەتۆچکە ـ نەتەوەیەك دەرکەوتن، بەواتای دیموکراتیکبوونێکی بێ بنەما دێت. ئەمەش بەو واتایە دێت کە کێشەی دیموکراتی زۆر سەختبووە، کەوتوتە قۆناخی چارەسەری.

لەئەنجامدا، ئەوا باسی ئەو کێشانە دەکەین کە لە سەرەتای سەدەی "11"وە هەن، لەسەردەمی ئۆغوزەکاندا بەرەو هەڵکشان دەچوون و دواکاری بەرەو ئیسلامی چوونی چارەسەرکردنەکەیان، سەرەتای کێشەکانی دیموکراتیەتی ئەمڕۆ لە تورکیادا دروست دەکات. پلەدارەکان"هیرارشی"ی سەروو لە شاخەکان، دەیانوویست ببنە دەوڵەت و کێشەکانیان چارەسەر بکەن، بەشە هەژارەکەیان لەژێر ناوی تورکمان لە رۆژهەڵاتی ناوین بڵاوبوونەوە، ویستیان ژیانیان لە رەوشی دیموکراتی سەرەتاو سروشتیدا بەردەوام بکەن. تایبەتمەندی توێژی سەرەوی ئەتنیکی، لە ناو کلتوری عەرەب و فارسدا توایەوە، تورکمانە شاخ نشینەکان تایبەتمەندیە ئەتنیکیەکانیان تا رۆژی ئەمڕۆشیان هێناوە. ئارستۆکراتیەتی شاخەکان وەکو بەڕێوەبەرانی دەوڵەت و فەرماندارانی سوپا شوێنی خۆیان لە شارستانیەتی ناوەندیدا گرت، هەرچەندە تورکمان ژیانی کۆنیان بەگرانی کۆچەرایەتیش بێت، بەشداری ژیانی دانیشتووانی ئاسای بوون. زیاتر تێکەڵی خەڵکە نیشتەجێبووە ئاسایەکە بوون. ئەو رژێمەی چ لە سەردەمی سەلجوقی و ئاتابەگەکان، چ لە سەردەمی عوسمانیەکاندا، بەشێوەی شارستانیەتی هاوبەشی ئارستۆکراتیەتی فیوداڵی پێشکەوت، ئەو رەوشە لەناو یەکتربوونەدا لە ئاستی گەلاندا، وەکو رەوشێکی سروشتی ژیان بەردەوامبوو.

باوك و باپیری تورك و کورد ئەوانەی ئەمڕۆ، هەرچەندە لەنێوانیشیاندا هەندێك ناکۆکیش هەبێت، لە ناو ئەو جیاوازیەشدا بوون کە لەناو تێکەڵاویەکی ستراتیژیشدابوونە، ئەمە رۆڵێکی ژیانی دەبینێت. دەبینین کە هێشتا لە سەدەی"11"وە، لە کردنەوەی دەرگاکانی ئەنەدۆڵدا لە شاخنشینەکانی ئۆغوزەکان و شەڕ لە دەژی سوپای خاچپەرستەکاندا، هەردوو گەل لەناو ستراتیژیەکی هاوبەشدا جموجۆڵ دەکەن. ئەو پەیوەندیە ستراتیژیەی کە بەگە کورد و تورکەکانی تێدەپەڕاند، بەتەنها لەدژی ئیمپراتوریەتی بێزەنتینی دروست نەبوو، لە بەرامبەر خاچپەرستەکانیش سنوردارنەما، بەڵکو لە دژی سوڵتان، پاشا و ئەمیرە عەرەبەکانیشدا بەهەمانشێوە بوو. دروستکردنی هەرێمی کوردستان بۆ جاری یەکەم لە سەردەمی سەلجوقیەکاندا، ئەو راستیە دەسەلمێنێت. ئەو تێکەڵاویە لە خانەدانی ئەیوبیەکاندا زیاتر سەرنجراکێشە، لەکاتی ئارتووك ئۆغلولەر، کارەکۆینلولەر و ئاك کۆینلولەردا بەردەوام دەبێت. کێشەکانی کە ئیمپراتوریەتی عوسمانی لەکاتی کرانەوەیان بەرەو ئێران، عەرەبستان و قەفقاسیا دا رووبەڕووی بوونەوە، لە ئەنجامی خەریك بوونی ماوەیەکی زۆری ئیدریسی بەتلیسی بە دیبلۆماسیەتەوە، بە یەکبوون لەگەڵ بەگە کوردەکاندا ئەنجامگیردەبێت. ئیمپراتوریەت دوو قات گەورەدەبێت. لەنێوان دوو کۆمەڵگادا، لێکچواندنی بە ئاسیملاسیۆن"توانەوەی" سروشتی دروستبوون و تایبەتمەندی کلتوری هاوبەش زۆر فرەوان ئەنجامدراون.

کاتێك مۆدێرینیتەی ئەوروپا بە ناپلیۆن لە سەرەتای سەدەی"19"دا وەرچەرخا بۆ قەڵمبازێکی ستراتیژی و کەوتە ناو کلتوری رۆژهەڵاتی ناوین، کردەوەی داگیرکەری و دەستبەسەرداگرتنەدا تا دەچوو زیاتر دەبوون، ئەو هاوسەنگیانەی هەبوون لە ریشەدا هەژاندنی و بەرەو گۆڕانکاری بردن. ئەو ژیان وکلتورەی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری کە لە ناو خەڵکی کریستیانیدا زوو پێشکەوت، نزیکایەتی دەوڵەت ـ نەتەوەی هێشتا گەرمترکرد. مۆدێرینیتە لە سەدەی "19 و 20"دا، کلتوری رۆژهەڵاتی ناوینی یەکگرتنی بەهەزاران ساڵەی، بە رەگەزی دەوڵەت ـ نەتەوە پارچەکرد، رێگای لە بەردەم ئالۆزی، قەیران و شەڕی گەورە کردەوە. ئیمپراتوریەتی عوسمانی بە پرۆژەی دەوڵەت ـ نەتەوەی رۆژئاوا، پارچەبوو و رووخا. جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقی بۆ ئەوەی لەناو دەوڵەتدا دەوڵەتێکی تر دروست بکات، دەست بە کۆمیتەگەرایی کرد، لە ساڵی"1906"دا دەربازی قۆناخی کۆمیتەی چەکداری بوو و قەیرانی دەوڵەتی زیاتر قووڵکردەوە. بەناوی وەستاندنی شەپۆلەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەی مۆدێرینیتە، بەرەو دروستکردنی نەتەوەپەرستیەکی زۆر کۆنەپەرست، شۆڤێن و فاشیست چوو. ئەو شەپۆڵە تورك پەرستەی کە زۆربەیان تورك نەبوون، چ لە رووخانی ئیمپراتوریەتدا، چ پێش دەربازبوون بۆ قۆناخی کۆمار، لە دژ ـ دیموکراتی بوون و چەقبەستکردندا، بوونەتە هۆکارێکی سەرەکی. ئەوەندەی دەوڵەت ـ نەتەوەیی بەرامبەر، پشتگیری داوەتە پارچەبوون و چەقبەستکردن.

مستەفا کەمال کاتێك چەمك و هزر و دامودەزگاکانی کۆماری فەرەنسای سێیەمینی وەکو مۆدێل هەڵبژاردبوو، لە ساڵی"1919 ـ 1922" دا ( لە لایەکەوە لە بەرامبەر داگیرکەرانی دەرەوە کە زیاد دەبوون، لەلایەکی تریش لە بەرامبەر بەکرێگیراوانی سەڵتەنەت) بە شۆڕشی ژاکۆبەنیك پراکتیزەیکرد، بۆ قەیرانی دەوڵەتیش کە هەبوون ئەگەر سنورداریش بێت، چارەسەریەکی پەیدا کردبو. دروستکردنی کۆماری تورکیا، لەسەر وێرانەیەکانی ئیمپراتوریەتی کە ئەو قەیرانانەی هەیبوو و کۆمیتەگەرایی ئیتیحاد و تەرەقیش قوڵتری کردبووەوە بەرەو پارچەبوون و رووخاندانی بردبوو. بەشێك لە کێشەکانی دەوڵەت چارەسەر ببوون، بەڵام کێشە کۆمەڵایەتیەکان هێشتا زیاتر قووڵتر بوونەوە. پرۆژەی کۆمار پرۆژەیەکی مۆدێرینیتە بوو. بە پەسندکردنی هێزەکانی رۆژئاوا لە لۆزاندا جێبەجێبوو. شۆڕشی ژاکۆبەنی ساڵانی"1920 ـ 1922"، دەیتوانی تەنها خۆی بە دەربازکردنی قەیرانەکانی دەوڵەت سنوردار نەکات. ئەگەر هێزە هاوپەیمانە نەتەوەپەرستە تورکو عەلمانی، سۆسیالیست، ئومەتگەرا و نوێنەرەکانی کۆمەڵگای کوردی، بە گەلەکۆمە و

ئاژاوەگێری کە هێشتا ناوەڕۆکیان روون نەبۆتەوە لە دەرەوەی کۆمار نەهێشترابوونایەوە، بەئاسانی دەتوانرا کۆمار بەرەو دیموکراتی وەرچەرخابووایە. هەرچۆنێکیش بوو سەرکەوتن بە هاوپەیمانیەتی ئەو هێزانە پێکهاتبوو. ئەو لە دەرەوە هێشتنەوەی کە بە گەلەکۆمەو ئاژاوەگێری بەڕێوەدەچوو، پەیوەست کردنی بە مستەفا کەمال، بۆ لێتوێژینەوەیەکی ورد گرنگە. لەبەر ئەوەی لەبەرامبەر مستەفا کەمالیش گەلەکۆمە، بەمەرامی کوشتن لێدان و ئاژاوەگێری دروست بیوون. لێرەدا رۆڵی بەرچاو هی کادیرە ئیتیحادگەراکانە کە مستەفا کەمالیان خستۆتە چەمبەرەوە. "CHP" بەناو گۆڕاوە، بەڵام لە ناوەڕۆکدا شێوەی نوێی پارتی ئیتیحادو تەرەقی وەرگرتووە. مستەفا کەمال بە تاقیکردنەوەی فەرقەی سەربەست لە"1930"دا قۆرخکاری "CHP"ی تاقی کردۆتەوە، بەڵام نەی توانیوە سەرکەوتووبێت. دوای ساڵی"1935" "CHP" بەشێوەیەکی ئاشکرا بەرنامەو پەیڕەوی ناوخۆی پارتی فاشیستی ئیتالیای بۆ خۆی وەکو مۆدێلێك پەسندکردوە، رووبەڕووی کاردانەوەی ئاشکرای ئەتاتورك بۆتەوە.
پێویستە مرۆڤ ئەمە بەگرنگ دەستنیشان بکات: ئەوەی دوای ساڵی"1926" سەنگی کەسایەتی ئەتاتورك نییە، هەنگاو بەهەنگاو بەدەستخستنی کۆمار لەلایەن کادیرەکانی ئیتیحادگەرا و ئەزمونی ئەو زهنیەتە فاشیستەی لەسەر بنەمای دەوڵەتگەرای ـ نەتەوەی بێسنور خۆگەیاندنە بەدامودەزگاکردن. ئەو نزیکایەتیەی ئەتاتورك کە زۆر روونە، ئەویش سیاسەتی سوپا لەدەرەوەی سیاسەت هێشتن و دروستکردنی دەوڵەتی یاسا، رتکردنەوەی رەگەزە چینایەتیەکان و بەشی پاوانخواز، لە بەرامبەر دەرەوە سەربەخۆی و ئازادی، لەلایەن ئەو کادیرانەی کە خستبوویانە چەمبەرەوە بە گەلەکۆمە و سیاسەتی ئیمتیازی، بێ کاریگەرکراو و ئەو سیاسەتە هەتا رۆژی ئەمڕۆ بە کودەتاکردن بەڕێوەدەچێت. ئەوەی شایەنی گوتنە، ئەزموونەکانی بەردەوامکردنی نەریتی کودەتاکردنی ناو کۆشك، کودەتا و گەلەکۆمەکانی ئیتیحادگەراکان، دەوڵەت لە دەوڵەتبوون دەرخستن، خستیانە دەستخۆیان و لە سەر کۆمەڵگا بەڕێوەبەرایەتیەکی دەستپۆتیك ئاواکردن. لەبەرامبەر ئەمەشدا بەڕاستیش بۆ ئەوەی دەوڵەت وەکو دەوڵەت بەردەوامبێت، زۆر تێکۆشانی گرنگ بەڕێوەچوون. ئاواکردنی کۆمار لەلایەن مستەفا کەمالەوە لەئەنجامی ئەو هەوڵانەوەدێت.
لە قۆناخی مۆدێرینیتەی رۆژئاوادا، ئەو دوو چەمکەی کە بەردەوام لە ناو شەڕدابوون، وەکو ئەوە وایە کە بەردەوام دەوڵەت لەناو قەیراندا هێشتووە، کۆمەڵگاشی رووبەڕووی کێشەی سەخت کردۆتەوە، نەی هێشتووە دیموکراتیەتێکی بە بڕیار جێبەجێ ببێت. کۆمار نەیتوانیوە خۆی لە هەبوونی مشەخۆری قۆرخکاری کودەتاچی، ئیمتیازی و ئۆلیگارشی رزگاربکە، بەڕاستیش نەیتوانیوە بێتە ئاستی دەوڵەتێکی یاسای عەلمانی، کۆمەڵایەتی و دیموکراتی. هۆکاری بنەڕەتیش بێگومان پاکتاوکردنی ئەو رێکەوتنە دیموکراتیەی کۆمەڵگا کە لە سەرەتای ساڵی"1920"دا دروستکرابوو، جموجۆلی هەژمونگەرای قۆرخکاری کودەتاچی، ئیمتیازگەر و ئۆلیگارشی بوو. ئەو هەوڵانەی لەناو دەوڵەت دەدرێن، پەیوەندی بە یاسا، دەوڵەتێکی کۆمەڵایەتی، عەلمانی و دیموکرات نییە، ئەوەی هەرە باڵادەستە بەدەستخستنی قازانجی دەسەڵاتداریەتیە.
ئێمە دەتوانین ئەو قۆناخە لە مێژووی کۆماردا تاکو ئێستا جیا بکەینەوە بۆ سێ خول. خولی یەکەم لە نێوان ساڵانی "1926 - 1950"، دەتوانین وەکو ئۆلیگارشی بیرۆکراتیکی باڵادەستی یەك پارتی بەناو کەین. خولی دووەم، لەنێوان"1950 - 1980" قۆناخی شەڕی توند و کودەتاکان بۆ سەرلەنوێ بەشکردنی قازانجی دەوڵەت لە نێوان خاوەن زەویەکان کە دەیانەوێت بە ئۆلیگارشی بیرۆکراتیك ببنە خاوەن بەش، بورژوازی بازرگان و خاوەن پیشەکانیش کە لەلایەن دانیشتوانی دەرەوە هاتوون بەڕێوەدەچن. خولی سێیەمیش، لەنێوان"1980 - 2010" ئەو قۆناخەی کە بەدەستێوەردانی یەکسەری سەرمایەی فینانسی جیهانی، بەشداربوونەکە دیارەکەشی بۆ قازانجی دەوڵەتە. تایبەتمەندی هاوبەش لەنێوان هەرسێ قۆناخەکەدا، ئەو دەوڵەتەی پێشکەوتووەو قۆرخکاری سەرمایەداری تایبەت دەرکەوتوون و بەڕێوەبەرایەتیە ئۆلیگارشیە توندڕەوەکانی لەسەر چین و توێژەکانی کۆمەڵگادا بەجێکراون. بۆ ئەمەش بە شەڕی پارتی و سەندیکاکان کە بەئامانجی بەدەستخستنی دەوڵەتن بەپێری تێپەڕدەبێت. ئەو هێزە هەژموونگەرانەی کە ئەم قۆناخە لەدەرەوە کۆنترۆل دەکەن، لەماوەی "1925 - 1945" لە راستیدا ئیمپراتۆریەتی بەریتانیایە، لە ماوەی نێوان"1945 - 2010"ش ئەمریکایە. دوای ساڵانی"1950" هەندێك لە ئەمریکا، "IMF"سندوقی دراوی نێودەوڵەتی و بانکی جیهانیش لەم قۆناخەدا بوونە هاوبەش. بەڕێوەبەری سەرەکی گلادیۆی ناتۆیە.
هێزە هاوپەیمانەکانی دامەزراندنی کۆماریش، لەبەرامبەر ئەو هەژمونگەرایەی لەبەرامبەریان بەڕێوەدەچێت، بەشێوەیەکی سروشتی لە رەوشی بەرخودانی دابوونە. هەرچەندە لەناو هەرسێ قۆناخەکەشدا لەیەکتری دابڕاوو بڵاویش بن، ئێمە دەبینە شایتحاڵی بەرخودان یان هەوڵدانیان بۆ یەکبوونیان لەگەڵ سیستەم. ئەو هێزانەی کە سەرەتا لەلایەن هێزە هەژمونگەراکانەوە کودەتایان بەسەردا کرابێت، چەوساندنەوەو بوونە قوربانی هێزە سۆسیالیست و کۆمەنیستەکان کە بە رووسیای سۆڤیەتەوە پەیوەستبوون کەلە دامەزراندنەوە بەکاریگەربوون. قۆناخی لەناوبردن کەبە کوشتنی مستەفا سوبحیەوە دەستپێکرد، بەداخستنی پارتی کۆمەنیست لە ساڵی"1927"، بەدەستگیرکردنی حیکمەت کڤڵجمل و نازم حیکمەت قووڵکراوەتەوە. دوای ساڵی"1950"فشار و دەستگیرکردن بۆ کەوتنە ناتۆ وەکو ئامرازێك هێشتا زیاتر بەکارهاتووە. سۆسیالیستەکانی کە بە کودەتای بیرۆکراتی"27 ئایاری 1960"دا دروستبووە، هەرچەندە ویستیان خۆیان ببین و هەنگاوی دیموکراتی باس بکەن، بە کودەتای"12 ئاداری 1971" دووبارە بێدەنگ کرانەوە. هەرچەندە بەرخودانەکەیان هەتا"1980" ویسترابێت بەردەوامیش بکرێت، بە کودەتای"1980" هێشتا زیاتر بێدەنگ کران و تا رۆژی ئەمڕۆ بەهیچ شێوەیەك نەیانتوانیوە بێنەوە سەرخۆیان. هێشتاش بێ ئەوەی خۆیان وەکو دیموکراتی رادیکاڵ بگەینە رێکخستنێکی هاوبەش، بەشی زۆریان بەشێوەیەکی بڵاو، بێبەرپرسیارو زۆر لاواز هەوڵدەن هەبوونی خۆیان بەردەوام بکەن. ئەوانیش بەگوێرەی هێزەکەیان ئەو ئەرکەیان لەسەرشانە کە هەنگاوی چالاك و دیموکراتی باوێژن.

ئومەتگەرا ئیسلامیەکان لەبەرامبەری هەمان ئەو کودەتایانە، ئەو دەستگیرکردن و دوورخستنەوانەی رووبەڕووی بوونەوە، بە بەرخودانێکی کەمتر، بەڵام لەناو خۆیاندا بەکۆکردنەوەی کاردانەوەیەکی زیاتر رووبەڕووی بوونەتەوە. لەنێوان ساڵانی"1923 - 1950"دا، ئەو بەرخودانە رۆشنبیریەی کە لەکەسایەتی محمەد عاکیف، سەعیدی نەوڕسی و نەجیب فەزل بەڕێوەچووە، جموجۆلی ئیسلامی مۆدێرێن بووە. بەواتایەکی تر بۆ برایەتی موسڵمانی تورکیا و بۆ بەرخودانی ئیسلامی کە لە نوێ وە شرۆڤەکراوە رێبەرایەتی دەکات. لە نێوان ساڵانی "1950 - 1980"دا چ لەناوخۆ و چ لە دەرەوە، بەهەندێك هێزی قۆرخکار پەیوەندیان پێشخستووەو بوونەتە هاوبەشی دەسەڵاتداریەتی یان قازانجی دەوڵەت، بەڕێگای سەرمایەداری تایبەت کەوتنە ناو قۆناخەکەو بوونەتە قۆرخکاری سەرمایە. جولانەوەی ئەربەکان، جولانەوەی ئیسلامی ئەوکاتە. زۆرێك لە شەپۆڵەکانی هیواو بەرژەوەندی بۆ نوێنەرایەتی دەسەڵاتداریەتی گوزارەی لێ دەکەن. جولانەوەی سەعید نەوڕسی کە وەك نورچیەتی بەردەوام دەبێت، لەژێرەوەش بەچەند لایەکەوە بەردەوامە. لەپلانی دواوەی مێژوودا نەخشبەندیەتی سەدەی"19" هەیە. سەرەڕای ئەوەی سیستەمێکی دیموکراتی سنووردار لە رێگای ئەواندا بەرەو پێش بەرن، نەیان توانیوە ببنە خاوەن هەڵوەستێکی دیموکراتی بەبڕیار و بەسیستەم. هەرچەندە لەنێوان ساڵانی"1980 - 2010" لەکەسایەتی تورگووت ئۆزاڵ بۆ خۆیان چەترێکی پاراستنیان پەیداش کردبێت، لە قۆناخی دەسەڵاتداریەتی و سەرمایەداریدا، بەردەوام لەلایەن ئۆلیگارشی بیرۆکراتیکدا لە ژێر هەڕەشەدابوونە. بەتایبەت پەیوەندیەکانیان لەگەڵ ئەمریکا، یەکێتی ئەوروپا، IMF، بانکی جیهانی و دەوروبەری سەرمایەی عەرەبیان پێشخستووە، ئەوانەش بوونەتە هاوبەشی سیستەم، دوای سەرۆك وەزیرایەتی کەمی ئەربەکان، لەماوەی پێشەنگایەتی سەرۆك وەزیرایەتی ئەردۆغان، ئەو هاوبەشیەتیە هێشتا زیاتر هەمیشەیی بووە. ئەم هێزانە بەرامبەری کێشەی قووڵی دیموکراتین. لەبەرامبەر ئۆلیگارشی بیرۆکراتیك بەردەوام خۆیان لەژێر هەڕەشدا دەبینن. ئەو هەڕەشانە یان بە هەنگاوی دیموکراتی تێپەڕینن، یان ئەگەر ئەو هەنگاوانە نەنرێن، بەئۆپەراسیۆنی کودەتا کردن و بڵاوەپێکردن وەکو ئەوەی بەرامبەر چەپەکان کرا ــ دادگایکردنی ئەرگەنەکۆنیش گوزارە لەو راستیە دەکات ــ ئەوا ئەو ئاستەی کە هەیانە لەدەستی بدەن.

لە بەرامبەر ئۆلیگارشی بیرۆکراتیك ئەو بەشەی کە ئاستەکەی هەرە مەترسیدار و تراژیدیە، کوردن کە لە دامەزراندنی کۆمارەدا لە ئاستی هێزی هاوپەیماندابوون. لەگەڵ ئەوەی ئەندامێکی رەسەنی کۆمارن و شەڕی رزگاریش هەردەبووا ببوایە، ئەو رەوشەی کوردیان تیا خزاندوە زۆر مژاویەو بە چەندین گەلەکۆمە، ئاژاوەگێڕی و دوورخستنەوە پەیوەستە. هەمان ئەو سیاسەتەی کە پێش ئەوە بۆ ئەوەی ئەنادۆڵ لە رۆم و ئەرمەنیان پاك بکەنەوە، لەماوەی"1925 - 1950" بەسەر کوردانیشیاندا سەپاند و سیاسەتی بێ کورد کردنیان بەڕێوەبرد، قۆناخی سەرهلدانەکانی"1925 - 1938"یش بەو سیاسەتەوە پەیوەندیدارە. ئەوەش مایەی تێگەیشتنە. رۆڵی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا لێرەدا، هەمان رۆڵی پاکتاوکردنی رۆم، ئەرمەن و ئاشووریانە. دەمێکە راکێشانی رژێمێکی باڵادەست بۆ کۆمار و پەیوەستبوونی بە مۆدێرینیتەی سەرمایەداریەوە، پەیوەندی بە ئیمپراتۆریەتی بەریتانی دیاریکراوە. دەتوانین بڵێین لە نێوان کایرەکانی بە تێڕوانیننی مستەفا کەمال و عیسمەت ئینینۆدا، ململانێکی زۆر توند هەیە، راکێشانی لاینگرانی راستڕەو، دژە ـ دیموکراتی کۆمار لێرەدا رۆڵی بینیوە، لەبەرامبەر ئەوەی کە مستەفا کەمال دۆستی سۆڤیتە و هەڵویستەکانی سەربەخۆن، لایەنەکەی تریش لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی بەریتانی لەناو پەیوەندی هەمەلایەن دابووە.

دوای سەرهلدانەکان وەکو ئەوەی کێشەی کورد کۆتای پێهاتووە تەماشاکراوە. جولانەوەیەکی زۆر بچوکیش وەکو زیندیبوونەوەی مردوو شرۆڤە کراوە یەکسەر لەناو براوە. ماوەی نێوان"1950 - 1980" بۆ کورد، بەسەلماندنی هەبوونی خۆی کە کێشەیەکی زۆر گەورەیە تێپەڕیوە. هەموو گفتوگۆیەکان لە دەوروبەری کێشەی" کورد هەیە یان نا؟" پێشکەوتووە."PKK" لەگەڵ دەرکەوتنی لەسەر بنەمای تێپەڕکردنی ئەم پرسە و کەوتنە قۆناخی رزگاری، بەشێوەیەکی ئۆبژکتیف"بابەتیانە" بەناوی هەموو ئۆپۆزیسیۆن بۆتە هێزی سەرەکی لەماوەی "1980 - 2010". لەگەڵ کودەتا"12ی ئەیلولی 1980" ئەو قۆناخەیە کە کێشەکان هەتا ئاستێکی بەرز سەختبوونە، لە تەواوی جیهاندا مافەکانی مرۆڤ پێشێل دەکرێن، لەناو دەوڵەتدا چەتەبوون باڵادەست بووە، دوای ئەوەی ئەمریکا پشتگیری خۆی لە بزووتنەوەی ئەرگەنەکۆن کشاندەوە کە ئەویش سەر لەنوێ وەکو گلادیۆی تورك خۆ رێك دەخاتەوە ئەنجامگیربووە. لە تشرینی دووەمی"2007"دا، ئەو رێکەوتنەی لەنێوان ئەمریکا و کۆماری تورکیادا دروستبوو، لەسەر بنەمای لەبەرامبەر پاکتاوکردنی"PKK"، پاکتاوکردنی گلادیۆی تورك، ئەو رەگەزانەی بەرگری دەکەن هێنایانە دادگا، رەگەزەکانی تریشیان راکێشایە ناو دەزگاکانی بەسیستەمی دەوڵەتی بوون. بەتەواوی لەم خاڵەدا، ئێمە بووینە شاهێدحاڵی گفتوگۆیەکی گەورەی دیموکراتیەت و جموجۆڵکردن بۆ سەر لەنوێ گۆڕانکاری کۆمارێکی دەستوری و دیموکراتی.

ئەوا چۆن لەناو ئەو قەیرانەی کە لەهەموویان گەورەترە لە مێژووی کۆماردا و بە هەموو خێرای خۆی بەردەوامە چ لەناو دەوڵەت و چ لەناو کۆمەڵگادا بەڕێوەدەچێت دەربکەون، ئەوا هەڵوێستی ئەو هێزانەی هەیە نیشانبدات. گفتوگۆ و بەداداچوونەکانی دەستورێکی دیموکراتی، هەم هۆکارەو هەمیش ئەنجامی ئەم قەیرانەیە. ئەوەی راستیبێت هەردووکیان لەناو هێزێکی چالاکدان کە یەکتری دەئافرێنن. لەم رەوشەدا دیسان کێشەی کورد سەرەکیە. لە راستیدا ئەو حەقیقەتە بە پێوانەی قووڵی مێژوویەوە پەیوەستە؛ ئەویش کێشە کۆمەڵایەتیەکان هەرگیز بە فشار لەناو نابردرێن، کاتێك دەرفەت دەبینێت لەهەر کاتێك بەتینتر سەرهلبداتەوە. ماوەی نێوان"1920 - 1925"یش لەو لایەنەوە وەکو ماوەیەکی زۆر سەرەنجڕاکێش سەر لەنوێ وەکو خۆ دووبارکردنەوە بەڕێوەدەچێت. بەڵام ئەمجارە هەموو هاوپەیمانەکانی دامەزراندان نە بۆ چەوساندنەوە، بەڵکو بۆ ئاواکردنەوەی سەر لەنوێی کۆماری دیموکراتی کە لەکاتی خۆیدا ئاوانەکرابوو، وەکو ئەوەی بانگی سەرکار دەکرێن. شرۆڤە کردنی ئەو هێڵە باریکەی لەنێوان مێژوو و ئێستادا و ئەوەش وەکو خۆ

دووبارەکردنەوەێك بەڕێوەدەچێت، دەرفەت و چانس دەدات کە ئەو ڕاستیە باشتر تێبگەین و ڕۆڵی مێژووی ببینێرێت.
ب ـ دەرکەوتن لە قەیران و چارەسەری دەستوری دیموکراتیانە
لەنێوان هەموو لایەنەکانی کۆمەڵگادا، سەبارەت بە دیموکراتیزەکردنی تورکیا ڕێکەوتنێکی نادیار دروستبووە. ئەوەی نابینرێت، ئەو داخوازیە نادیارە"زمنی"و مێژوویە گۆڕین بۆ ئیرادەیەك کە هەیە. دەستوری دیموکراتی، گوزارشت لەحەقیقەتی ئەو ڕاستیە و ناوەڕۆکەکەی دەکات. بەشی دووەمی ئەم هەڵسەنگاندنە، بەتایبەتیش لە بەشی پرەنسیبەکاندا، ئەوا ئەم داخوازیە دیموکراتیە مێژووییانە بەکامە دەستوری دیموکراتی پێشوازی بکرێن، چوارچێوەیەك لەوبارەیەوە پێشکەش دەکات. ئەو پرەنسیبانەی کە پشتەبەستن بە چەمك و بیرکردنەوەی زانستی، لەسەر بنەمای دەرکەوتن لە قەیران و دەستورێکی دیموکراتی، بۆ سەر لەنوێ ئاواکردنەوەی کۆمار، دەتوانین سەرلەنوێ و بەشێوەیەکی زۆر کورت و جەوهەری گوزارەی لێ بکەین.
1ـ نەتەوەی دیموکراتی: پێناسەی نەتەوەی دیموکراتی کە پشتەبەستێتە بنەمای لەهەر کلتورێك بێت، لەکامە ئەتنیك و ئاینێکدا( چەمکی ناسنامەی نەرم و سەر کراوەبێت)، لەو کەسایەتیانەی کە ماف و ئازادیە بنەڕەتیەکان پێکەوە دابەشدەکەن، بەو شێوەیە مافی کۆلەکتیف"هاوبەش" و تاك لەیەکتری جیاناکرێنەوە، بەشێوەیەکی گونجاو بەپێناسەی وڵاتی هاوبەش، خاوەن تایبەتمەندیکە کە یەکبوونێکی بەرفروان پێك دێنێت.
2ـ وڵاتی هاوبەش"وڵاتی دیموکراتی": پێویستە بێ ئەوەی بکرێتەماڵی ئەتنیکێك یان گرووپێکی ئاینی، بێ ئەوەی بەرەو وەکو ئەوەی ترلێکردن بچین، کۆمەڵگایەکی ژینگەپارێز، ئابووری و دیموکرات و تاکی ئازاد، شوێنێك کە هاوڵاتیانی دیموکراتی تیادا دەژن، پێناسەی بکرێت. ئەم پێناسەیە بەتەنها بۆ خۆی خاوەنی مانا و دەوڵەمەندیەکە دەتوانێت یەکێتیەکی فروان پێك بێنێت.
3ـ کۆماری دیموکراتی: پێویستە دەوڵەت وەکو ئەوەی لەبنەڕتدا تایبەتمەندی عەلمانی، حقوقی و کۆمەڵایەتی دیاری دەکات و پێکی دێنێت، کۆمەڵگای دیموکراتی بۆ خۆی بە بنەما وەردەگرێت. کۆمەڵگایێك کە دیموکراتیەتی تیادا بەڕێوەدەچێت، وەکو ڕەنگی دەوڵەتی هەرە باشی کۆمارە. لەکۆمارێکی وادا تایبەتمەندی عەلمانیەت، کۆمەڵایەتی و حقوقی وەکو ئەنجام دەردەکەونە ڕوو.
4 ـ چارەسەری دیموکراتی: دەزگاکانی کۆمار و دەزگاکانی کۆمەڵگای دیموکراتی پێکەوە بەئاشتی هەبوونیان، بنەمای چارەسەری دیموکراتیانەیە. لەناو ئەو پێناسەیەدا، دەوڵەت ـ نەتەوە، سەرمایەداری و قۆرخکاری پیشەسازیگەرایی، لەگەڵ دەزگاکانی کۆمەڵگای دیموکراتی ئەوانەی کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی، ئابووری و ژینگەپارێزی کۆمینالیزم، ژیانێکی بەئاشتی کە پشتەبەستێت بەرێکەوتن پەسند دەکرێت. ئاشکرایە دەوڵەتێکی بێ دیموکراتی چەند ریدەکرێتەوە، دیموکراتیەتێکی بێ دەوڵەتیش ناسەپێندرێت.
5 ـ لێکجیانەبوونەوەی مافەکانی تاك و کۆلەکتیف"هاوبەش": کۆمەڵگا ئەوەندەی هەبوونەکەی کۆلەکتیفە، ئەوەندەش تاکە، بەقەد تاك ئەوەندەش کۆلەکتیف. هەردووکیان لەیەکتری جیاکردنەوە درۆیەکی لیبراڵە، بەمەبەستی داگیرکەری و فشارە. ڕێگا گرتن لەم یاریە، بەتەنها دەکرێت مافەکانی تاك و کۆلەکتیف وەکو گۆشت و نینۆك پێکەوە جێبەجێبکرێن.
6 ـ سەربەخۆی ئایدیۆلۆژی و ئازادی: هەتاکو لەگشتیدا هەژمونگەرای ئایدیۆلۆژیای شارستانیەتی چینایەتی، بەتایبەتی لە مۆدێرینیتەی سەرمایەداری دەربازنەکرێت، چارەسەری کێشەکانی دیموکراتیەت ئفلیج و لاواز بەمێنێت. بەتایبەتی لەگەڵ پۆزەتیڤیزمی ئەوروپادا، کلتوری ڕۆژهەڵاتی ناوین بەئازادی لێکۆڵینەوەکردن و بەرەو چارەسەری دیموکراتی گواستنەوەی زەحمەتە. ئەوانەی کەوا بەتەنها لەناو سروشتی کۆمەڵگای خۆیاندا و مێژووی خۆیان بەئازادی گەیاندۆتە چەمکی، هزراندن و بەدەزگاکردن، دەتوانن بگەنە ئەو لێکۆڵینەوەو چارەسەریانە، ژیانی ئازاد پێکبێنن.
7 ـ مێژوویی بوون و ئێستای بوون: ئەوەندەی مێژوو مەرجی ساتی ئێستای دروستکرد، ئێستاش ئەوەندە مێژوو دەخاتە بەرچاو. جیاوازی نێوانیان، دەرفەتی دەسخستنە ئێستا یان چانسی ئازادکردن پێشکەش دەکات. وەکو ئەوەی مێژوویێك بێ ئێستا نابێت، ئێستاش بێ مێژوو نابێت. هەوڵدانی مۆدێرینیتە بۆ بێ مێژووکردن، کۆمەڵگا و تاك بێ مێشك کردنە، بە ڕێگای بێ ئەخلاق کردن و بێ سیاسەت کردن، بەئاسانی خستنە ژێر فشار و داگیرکەری و شەڕ فێرکردنیەتی پێویستە ئەمە بەتەواوی نەهێڵدرێت.
8 ـ ئەخلاق و ویژدان: لە بەدواداچوونی کێشەکانی کۆمەڵگا و جێبەجێکردنی دیموکراتیەتدا، نزیکبوونی ئابووری و سیاسی بەتەنیا بەش ناکەن. کۆمەڵگا لەلایەنی هەبوونیەوە، لەسەرەتای مێژووەوە تاکو ئێستا بە ئەخلاق و ویژدان، بەردەوام لەناویکتریدا ژیاوە. ئەو شەڕەی کە مۆدێرینیتە لەبەرامبەر ئەخلاق و ویژدانی کۆمەڵگادا دەستپێکردوە، بەمەبەستی ڕەواکردنی فشار و داگیرکەریە، چارەسەری ئابووری و سیاسی کە سەرچاوەکەیان لەمەشدا دەگرن، لەناوەڕۆکدا وەکو ئەوەی لەوانەنییە، کێشەکانی کۆمەڵگا هێشتا سەختردەکەن و هەوڵە دیموکراتیەکان بێ کاریگەردەکەن. لەچارەسەری دیموکراتی کێشەکاندا، بە ڕەهای پێویستە مرۆڤ پێوانەی ئەخلاقی و ویژدانی بەسەر بکاتەوە کە شوێن نادات پێوانەی هێز.
9 ـ پاراستنی بنەڕەتی دیموکراتیانە: بەتەنها گیانەوەرە زیندوەکان نا، ئەوانەی وەکو بێ گیانیش بەناو دەکرێن، بەردەوام و لەهەر شوێنێك، بەسیستەمی خۆیانی پاراستنی بنەڕەتی دەژن، ئەوەش سەلمێنەرێکی زانستیە. لەبەر ئەوەش کۆمەڵگا، دەزگاکان و تاکەکانی کۆمەڵگای دیموکراتی، لەبەرامبەر ڕەگەزەکانی مۆدێرینیتەی دیموکراتی"دەوڵەت ـ نەتەوە، سەرمایەداری و پیشەسازگەرایی" پێویستە خاوەنی سیستەمی پارستنی بنەڕەتی کە بەش بکات بن. ئەوەش پێویستیەکی دەستلێبەرنەدراوی ژیانی ئازاد و یەکسانە.
لەتورکیا کاتێك ئێمە بەرەو چارەسەرکردنی کێشەی دیموکراتیزەبوون و کورد دەچین، ئەو هەڵسەنگاندە مێژوویانەی

بەکورتی کران و ئەو پێوانانەی کە بۆ کۆماری دەستووری دیموکراتی بە جەوهەری دەستنیشانکراون، باوەڕدەکەم کە ئەوە رووناك کرەوەو لێتوێژینەوەێك بووە. لەسەر ئەو بنەمایە کێشەی کورد بە ئاسانی لە یەکپارچەی دیموکراتی تورکیادا بەجێ و شیکاری بۆ دەکرێت، مۆدێلێکی چارەسەری گونجاو یان ئەلتەرناتیف دەتوانرێت دروست ببێت، دەکرێت پێشکەشبکرێت.

بەشی چوارەم: کێشەی کورد و ئەو چارەسەریانەی دەتوانرێت جێبەجێبکرێن

لەوانەیە کێشە سەرەتایەکانی کۆمەڵگا بە شارستانیەتی چینایەتی دەستپێکردبێت ئەمەش پەیوەندیدارە بە رەسەنایەتی کوردەوە. لەبلندبوونی شارستانیەتی سومەریدا، زیاترین دەستەواژە کەدەردەکەوێتە پێشمان کوورتی، هوری، گووتی، ئاری هەمان سەرچاوەمان بەبیردادێت. ئەم دەستەواژەیە بەواتای"چیای"،"خەڵکی چیایی" دەناسرێن، بۆ کوردەکانی ئەمرۆش وەکو ناونیشانێکە. شارستانیەتی سومەر وەکو دژە تێزی کۆمەڵگای نیۆلۆتیك پێشکەوت. بە گووتنێکی تر، خەڵکی دەشتای میزۆپۆتامیای خواروو، دجلە ـ فورات، لەبەرامبەر خەڵکی چیای ـ بەرزایەکان، لەبەرامبەر میزۆپۆتامیای سەروو وەکو ئەلتەرناتیف گوزارشت لە پێشکەوتنەکەی دەکات. کێشەکانی کۆمەڵگای نیۆلۆتیك پەیوەستە بەم پێشکەوتنەوە. بێگومان باسکردنی کۆمەڵگای نیۆلۆتیك و کوردبوونی رۆژی ئەمرۆمان بەتەواوی وەك یەکە، دەستنیشانکردنێکی زانستیانەیە. بەڵام لەنێوان ئەو میراتەی کۆمەڵگای نیۆلۆتیك و کە هێشتا ژیان دەکات و کۆمەڵگای پێش"10000" ساڵی، ئەو لێکچواندنەی هەن رێکەوت نین. مێژووی کۆمەڵگا دەڵێت؛ پێویستە پەیوەندی نێوانیان بەهێزبێت. شوێنەوارناس"ئارکۆلۆژی"و زمانناسی"ئەتیمۆلۆژی" باسی ئەو لێکچوونەی نێوانیان زۆر بەهێزترە. ئەو کۆمەڵگایەی لەبناری زنجیرە چیایەکانی زاگرۆس ـ تورۆس دا، شیمانەیەکی بەهێزە تایبەتمەندیەکانیان هی کوردی سەرەتابێت.

ئەو قۆناخەی پ. ز"5000"ساڵ هەتاکو بەرەو بڵاوبوونەوەی ئیسلامیەت تێپەڕدەبێت، مرۆڤ دەتوانێت وەکو قۆناخی سەرەتا هەڵیسەنگێنێت. دەزانرێت کە لە کۆمەڵگای ئەوکاتدا، لەسەروویاندا پلەداری، خانەدانی، دەوڵەت، شار، چین، بازرگانی، کشتوکاڵ، پیشەوەری، خێزان، ژن، کۆیلایەتی، ئاین، نووسین، زانست، وێژە، پەیکەرسازی، بیناسازی و پیشەسازی، دەزگاکانی پەیوەست بەشارستانیەتەوە، وەکو لافاو پێشدەکەون. پێشکەوتنەکانی لەم لایەشەوە، بەو واتایە دێت کە کێشەکانی کۆمەڵگاش وەکو لافاوێك گەورەببن. کوردەکانی سەرەتا لەناوەندی ئەو کێشانەدانە. رێگا چارەی سەرەکیش کە پەیدایان کردوە، بەرەو بەخێوکردنی ئاژەڵ و کشتوکاڵکردن چوون و بۆ ئەوەی لەدوژمنەکانیشیان رزگاریان ببێت، پشتیان بەستووە بەلوتکە پیرۆزەکانی چیا. ئەم دوو تایبەتمەندیە ئەمرۆش بەکاریگەرن لەسەر هەبوونی کورد. پلەداریەتی دەسترۆویشتووی کوردە سەرەتاکان، بەردەوام لەناو شارستانیەت و دەوڵەتاندا تواونەتەوە بەو شێوەیەش کێشەی چینایەتی و کومەڵایەتیەکانیان چارسەرکردوە، ئەو کۆمەڵە رەنجدەرانەی کەماون لە شاخەکاندا بەشێوەی خێل و تیرە لەنێوان دەشت و چیادا، هەوڵیانداوە بە کۆچەرایەتی و کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵ لەشەڕی لەناوبردندا خۆیان بپارێزن. ئەوەی لەچیادا ماوەتەوە زیاتر بەکشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵدا خەریك بووە کوردبووە" زۆر بەکەمی یاساکانی خراپ دەکات". پیشەوەری و بازرگانی کردنی شارەکانیش پیشەی ئەرمەنی و سوریانیەکانی ئەمرۆکەبووە. بەشێوەیەکی سروشتی کار دابەشکرابوو. خەڵکە رەسەنکەی دجلە ـ فورات، بەدیالیکتیکێکی ژیانی وەها پێکەوە گرێدرابوون.

ئەو گەلە جیابوونەوە هەرە گەورەکەی سەرەتا لەگەڵ کریستیانەکاندا کرد. پێش ئەوە خودای چەمك ئاسای ئیبراهیمی یەهۆڤا، نوێنەرایەتی جیابوونەوەیەکی هێشتا بنەڕەتری دەکرد. پێویستە هیچ کات لەبیر نەکرێت کە کێشە کۆمەڵایەتیەکان لەناوەڕۆکی شارستانیەتدا دروستبوونە، بەردەوام خۆیان بەناوی خوداو ئاینی نوێ گوزارەکردوە. چەندەی ئاین و چەمکی خودای بەناکۆك دروست ببن، ئەوەندە کێشەی کۆمەڵگا گەورەو جۆراوجۆربوونە. ئاینی زەردەشتی لە چیاکانی زاگرۆسدا پیرۆزی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵ یان گوزارشت لەخوداوەندایەتیەکەی دەکات، خوداکانی سومەر، بابل، ئەکەد و ئاشوریەکانیش شار، بازرگانی، دەوڵەت و خانەدانان نیشاندەدات. ئەمە بەئاشکرا دەڵێن. کریستیانی کەوەك جاری یەکەم وەکو ئاینی چەوساوەو هەژارەکان دەرکەوت، لەڕاستیدا بۆ کێشە کۆمەڵایەتیەکان دیسان بەزمانی خودای نوێ، گوزارشت لەبەداواداچوونی چارەسەریدەکات. موسەویەتی وەکو ئاینی تیرە دەرکەوتووە، کریستیانیش وەکو ئاینی خەڵك سەرچاوەی خۆی وەرگرتووە. هەنگاوی سەرەتای گەورە بەرەو ئومەتبوون و بازاڕی هاوبەشە. هەرچەندە محەمەدایەتی لەسەرەتای دەرکەوتنیدا گەل و ئومەتیش بەبنەمابگرێت، لەقۆناخی بوون بەسەڵتەنتدا وەکو ئاینی چینی باڵادەستی ئەوا شارستانیەتی دەوڵەت حاکمیەتی خۆی دروست بکات.

کوردایەتی چاخی ناوین" لەساڵانی 600وە یان لە دروستبوونی ئیسلامەوە هەتا ساڵانی 1800 کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هاتە رۆژهەڵاتی ناوین" میراتی چاخی سەرەتا بەردەوام دەکات. دروست بوونی توێژی سەرەوە" میر، بەگ، سەرکردە، شێخ لەگەڵ شارستانیەتی حاکم"عەرەب، عەجەم و تورکدا جیاوازی ناکات" بۆتە یەك، لەبەرامبەر ئەمەدا واز لەقسە کردن بەکوردی دێنن. وەکو دەوڵەت ژیانکردنی ئەوان، ئەوانەی کوردان بەگوێرەی بەرژەوەندی ئەوان گونجاو نییە. بەرژەوەندی ئەوان ناچاریان دەکات ببنە عەرەب، عەجەم و تورکێکی باش. بۆ کورد کێشە کۆمەڵایەتیەکان هێشتا سەختربوونە. هەم وەکو ناسنامە چەوسێنراوەتەوە، هەم وەکو ناسنامەی کلتوریش خیانەتی لێکراوە و کێشەکانی زیاتر قووڵبوونەتەوە.

ئایا کێشەکانی کورد ئەوانەی چاخی ناوین بەبوونە دەوڵەت چارەسەردەبوون؟ لەکاتی سۆسیالیزمی بونیادنراودا ئەو بیرۆکەیە دروستببوو. بیرکردنەوەیەکی بەوشێوەیە هەبوو ئەگەر گەل و ناسنامە بەدەوڵەت ببن، وەکو ئەوەی کێشەکانیان بگاتە چارەسەریەکی هەمیشەیی بەرهەمهێنرابوو. لەبەر ئەوەی سۆسیالیزم لەگەڵ بەدەوڵەتبوونی پرۆلیتاریا وەکو یەك

دەبینرا، مرۆڤ پێویست لەبەرامبەر بیرکردنەوەیەکی بەوشێوەیە حەپەساو نەبێت. ئاخی ئەوەمان هەڵکێشا بۆچی دەوڵەتێکمان نەبووە. بەڵام بیرکردنەوەی شارستانیەتی دیموکراتی، دەیسەلمێنێت کە دەوڵەتبوون سەرچاوەی هەموو نەخۆشیە گەورەکانە. شتێکی وەکو دەوڵەتی عەرەب، عەجەم و تورکیش نەبوو. ئەو هەڵخەڵەتاندنەی کە دەوڵەت ـ نەتەوە دروستی کردوە؛ بەتایبەتیش لەناو سەدەی دوایدا ! دەوڵەتێکی هاوبەشی ئیسلامی هەبوو. هەندێك جار لەبەر بەرژەوەندیەکانیان شەڕیش بکەن، دەسەڵاتدارەکانیان لەناو یەکگرتندابوونە. یەکیش لەوانە گەل و ئومەتی ئیسلام بوو. دونیابینیەکەیان لەیەکتری جیابووەوە. جیهانی کێشەکان هەر دەچوو گەورە دەبوو. دوو بەرەی سەرەکی هەبوون. ئەوەندەی چارەسەرکردن کێشەکانیش هاوبەش بوون. بەناوی ئاین و خودا گوزارەیان لێدەکراو دەخوازرا چارەسەربکرێت. کوردبوون، عەرەببوون، تورکبوون، فارسبوون ئەگەر وەکو کلتورێکیش هەبن، کێشەکانیان بەژێدەری ئاین و ئاینزای هاوبەش باسدەکرا. نە ئەمەوی و عەباسی بەتەنها بوونە دەوڵەتی عەرەب، نە سەلجوقی و عوسمانیش بەتەنها بوونە دەوڵەتی تورك. نەریتی باوی دەوڵەتی عەجەمەکانیش دەوڵەتی رەگەزپەرستی نەبوو. کورد، ئەرمەنی، ئاسوری، رۆم، تورکمان، بەدەویەکان"عەرەبی کۆچەر" و ئەو عەجەمانەی نەببوونە دەوڵەتیش، راستینەی کلتوری کەخستراونەتە ناو گێژاوی کێشەکان وەهابوون.

مۆدێرینیتەی سەرمایەداری کاتێك بە رەگەزەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە، سەرمایەداری و پیشەسازیگەرایی کەوتە رۆژهەڵاتی ناوین، بۆ ناسنامەی کلتوری و گەلان کە کلتورەکەیان تا دەچوو دەچەوسێنرایەوە، لەناودەبراو داگیردەکرا، لەچاخی ناویندا زۆر بێ هێزکرا و هاتە دزین، وەکو ئەوەی زەنگی مردنی لێ بدات وابوو. ئەو گەلانەی ماوەیەکی زۆرە رووبەڕووی خیانەتی حاکم و باڵادەستەی چینەکانی سەروویان بوونەتەوە، وەکو گۆڕەپانی راوکردنی نوێی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری بوونە. لەسەرەتای سەدەی"19" بەدواوە، بەناوی دەوڵەتۆچکەی ـ نەتەوەی یەکتریان پێ خنکێنرا. لەگەڵ ئەوەشدا لە کارگەکانی سەرمایەداری و پیشەسازیگەرایدا کە بۆ قازانجی بێسنور هیچ کۆسپێك ناناسێت، لە ئاژەڵ خراپتر بەکارهاتن. وەرچەرخانی قازانج بۆ سەرمایە. سێ قات بیانیبون پێشکەوت. بیانیبوونی چاخی سەرەتا، چاخی ناوین و چاخی ئێستا. لەبەر پێویستی نەتەوەپەرستی کە لەسەر هەر کلتورێکدا دەسەپێنرا، کوردیش لەو ئافاتەدا بەشی خۆی وەرگرت، هەمیش بەشێوەی هەرە گران ! دەوڵەتۆچکە ـ نەتەوەیەکەیان بەسەرکەوتووی بەئەنجام نەبوو. توێژی سەروو دیسان شایستەی میراتی خۆی بۆتەوە، لەناو دەوڵەتۆچکە ـ نەتەوەی دراوسێکاندا شوێنی خۆی گرتووە، لەبەرامبەر ئەمەدا خیانەت لە کلتوری دابوونەریتی گەلەکەی بە رەوا دەدیت. ئەمە بەهەڵوێستەکانی لە پاشا پاشاتر بانگهێشتکردن کە لە عەرەبێك، عەجەمێك و تورکێك زۆرباشترن، بۆ ئەمەش کەوتوونەتە پێشبرکێ. ئەوەندەی لەبەرامبەر نرخی کلتوری و ناسنامەدا خیانەت، بەواتای ئەوەندە بەرژەوەندی و پارەو مووچەدێت. کورد وایان باوەڕ دەکرد کە بەپشتبەستن بەکشتوکاڵ، مێگەلە ئاژەڵەکانیان و چیاکانیان کە بەهەزاران ساڵە لەسەردەمی کوردە سەرەتاکانەوە تا رۆژی ئەمڕۆ دوو هۆکاری هەبوونی پیرۆزن، ئەوا بتوانن لەبەرامبەر لەناوبردندا هەبوونیان بپارێزن.

ا ـ دیالیکتیکی مێژووی پەیوەندی تورك ـ کورد

لەناو ئەو گێرانەوە گشتیەدا، پەیوەندی و ناکۆکیەکانی تورك و کورد دوولایەنەن، لەنزیکەوە بەشێوەیەکی بەرچاو هەڵسەنگاندنی، ئەوا کێشەکان و هەوڵەکانی چارەسەری روونتر بکاتەوە. لەناو گێژاوی توندوتیژیدا، نەکێشە و نە رێگای چارەسەریش لەئاستێکی پێویستدا دەگێنێتە زانابوون. بەرچاو روونی و زانابوون لەگەڵ خۆیدا ئەگەر نزیکی حەقیقەت بێت، بەو واتایەدێت کە گەیشتووینەتە نیوەی رێگای چارەسەری. نیوەکەی تریش، بەو رێگایەی کراوەتەوە بەهەنگاوی گونجاو بەڕێوەبردنیەتی.

سەلجوقیەکان وەکو بەرزای و بەگایەتیش کاتێك گەیشتە سنوری کوردستان،" شیمانەی مەزن دەستەواژەی کوردستان لەلایەن سوڵتانی سەلجوقی کە گەیشتنە ئەو سنورە کلتوریەی کەکورد دروستی کردون باسی کردبێت." بەچەکی برایەتی ئیسلام لەبەرامبەر بێزەنتینیەکان پێشنیاری شەڕی هاوبەشیان کرد. لەبەر ئەوەی بەشێکی گەورە لە کوردان ئیسلامیان بۆ خۆیان پەسندکردبوو و لەبەرامبەر بێزەنتینیەکان زۆرجار رەوشێکی دواکەوتوویان هەبوو، پشتیوانی ستراتیژی شەڕی هاوبەشیان کرد. سوڵتان ئالپ ئەرسەلان لە ئایاری "1071"دا، ئەو کات لە مەیافارقین کەوەکو پایتەختی کوردان دەژمێردرا"سیلوانی ئەمڕۆ"، لەگەڵ بەگ و خێڵە کوردەکان لە هەوڵدانی رێکەوتندابوو. ئەو هێزەی کە هەم لە بەگ و هەم کوردی بەرزایەکان پێکهاتووە، گوومان دەکرێت کە نیوەی لەکوردان پێکهاتبێت، ئەوا بگاتە سەرکەوتنی ئابی"1071" وەکو خاڵی وەرچەرخێنەر دەژمێردرێت. هەتا رۆڵی هێزی بەرزایەکان"شاخەکان" و بەگە کوردەکان لەو شەڕە راست شیکار نەکرێت، ئەوا پەیوەندی نێوان بەرزایەکان و بەگە کورد و تورکەکان، لەئاستێکی باشدا شیکار ناکرێت. سەرکەوتنەکە ستراتیژی بووە. دەرگای ئەنادۆڵ بۆ بەگ و تورکەبەرزای نشینەکان هەتا دوای کراوە. بۆ کوردانیش هەرەشە و ئامانجی بێزەنتینیەکانی نەهێشت. بەجێکردنی پەیوەندی لەبەر ئەم هەنگاوە، زۆر گرنگە و لە دیاریکردنی دوارۆژدا رۆڵێکی سەرەکی ببینێت.

پاشانیش لە بنەمادا بەرزای نشین و بەگە تورکەکان لە ئەنادۆڵی ناوین و رۆژئاوای دەریای سپی و دەریای رەش کە بەرەو ئەنادۆڵ دەکشێت بڵاودەبنەوە، بەرزای نشین و بەگە کوردەکانیش شوێنی نیشتەجێبوونیان و هێزەکەیان زیاتر بەرەو پێشەوە دەبن. بەرزای نشین و بەگە تورکەکان هیچ کاتێك شوێنی کە کورد لێی سەردەست و نیشتەجێن و ئەو دابوونەریتەی ئەوان لە نیشتەجێبووندا نەیان ویستووە بەدەستی بخەن و ببنە خاوەنی. ئەو رێکەوتنە ستراتیژەی نێوانیان، هاودەنگی و کلتوری ژیانی هاوبەش، پێویستی بەمە دەکرد. لەم نێوەدا گەلانی ئەرمەنی و سوریانیش، هێشتا زیاتر هەبوونی خۆیان لە شارەکان بەدۆستانە بەردەوامکردن. لەنێوان ئەوان و بێزەنتینیەکاندا کێشەی ئاینزای هەبوون. دوورکەوتنەوەی بێزەنتینیەکان لەهەرێمەکە بۆ ئەوان زۆر خراپ نەبوو.

لەم کاتەدا هەرچەندە لەکوردستان بەناوی ئارتوکۆئۆغلولەر، کاراکۆیوونلەر و ئاك كۆیونلەر هەندێك لە بەگە تورکەکان بەجێکرابن، تەمەنیان کورت بووە، بەرزایی نیشینەکان کە زیاتر پشتیان دەبەست بە توانەوەی سروشتی، لەناو کلتوری کورداندا دەتوانەوە. شوێن پێی ئەو راستیە لەڕۆژی ئەمڕۆشماندا هێشتا دیارە. کوردیش لە سەردەمی ئیسلامدا بەزۆر بەگایەتیەوە ژیانی کۆمەڵایەتیان بەشێوەی خێڵ و تیرە، بەکێشەکانیان کەتا دەچوو سەختردەبوون بەردەوام کرد. تایبەتمەندی نەتەوەیان پێشدەکەوت. بەڵام وەکو لە بەرزای نشینەکانی تورکدا دروست دەبوو، توێژی سەروو لەژێرناوی شارستانیەتی جۆراوجۆر بەگەکان خزمەتکردنیان پێشدەخست، بەشی ژێریش وەکو کورمانج"کوردمانج" لە ئاستێکی جیاوازدا جیادەبوونەوە. لەناو کورداندا، لەم کاتەدا جیابوونەوەیەکی بەوێنەی دوولایەنی عەرەب ـ بەدەوی، تورك ـ تورکمان خێراتردەبێت. هەتا کاتی سوڵتانایەتی عوسمانیەکان" هەتا نزیکی ساڵی 1500"دا، لە پەیوەندی نێوان بەرزاینشین و بەگەکانی کورد و تورك، بەشێوەیەکی نادیار"زمنی"یش بێت لەنێواندا لەبەرامبەر مافی یەکتریدا بەڕێزن، لەبەرامبەر هەڕەشەکانی لە بەرامبەر هەردوو بەشی سەرەکی، ستراتیژیەکی هاوبەش پەیوەست بەمەشەوە جموجۆڵ هێشتا زەحمەتربوو. لایەنی پەیوەندی ئەرێنی لە لایەنی ناکۆك و نەرێنی هێشتا سەختتربوو. لەنێوانیاندا سەردەمێکی ناکۆك و شەڕی بەسیستەم نابیندرێت.

لە پەیوەندی نێوان کورد و تورکدا قۆناخی ستراتیژی دووەم و گرنگ، بەکرانەوەی ئیمپراتوریەتی عوسمانی بەڕووی رۆژهەڵاتی ناویندا دەستپێدەکات. لە سەرەتا سەدەی"16"دا لەنێوان خانەدانایەتی سەفەوی کە لە ئێران لە سەربنەمای پاشایەتی پێشدەکەوت و لەنێوان بەگە کوردەکان ئەو ئاڵۆزیانەی کە زیاد دەبوون، بەناکۆکی ئاینزایەتی هێشتا زیاتردەبوون و لەسەر ئەنادۆڵیش تادەچوو کاریگەری زیاتر دەبوو. هەمان ناکۆکی بە سوڵتانی مەملوکەکانیش کە ناوەندەکەیان لە میسر بوو بەڕێوەدەچوون. کاریگەری مەملوکیانیش لەسەر دەریای سپی و باشوری رۆژهەڵات زیاد دەبوو. ئاستی بەگایەتی کورد رۆڵێکی ستراتیژی دەبینی. لەگەڵ کامە لایەن رێکبکەون، ئەوا ئەو لایەنە ببووایە هێزی حاکم لە رۆژهەڵاتی ناوین. نزیکایەتی لە رێکەوتنی ستراتیژی سوڵتانی عوسمانی یاوەز سەلیم وەکو دوو هێزی یەکسان نزیك بۆتەوە، لە وانە درخستن لە ئەنجامە مێژوویەکان دوانەکەوت. ئەو رێکەوتنە نوێیەی کە ئەنجامدراوە، بۆ بەگە کوردەکان ناسکردنی خۆبەڕێوەبردن و ئەرکی حکومەتایەتین. لەڕێکەوتنێك زیاتر، رێگا لەبەردەم ئیمپراتوریەتی تورك و کورد دەکردەوە لە شێوەی ئیمپراتوریەتی نەمسا ـ هەنگاریا. ئەگەر چاودێرێك بە وردی تەماشای مێژووبکات، ئەوا هێشتا لە سەرەتا ساڵانی"2000"پ . ز لە ئەزموونی شارستانیەتی سەرەتای هیتی ـ هووری ـ میتانی لە تایبەتمەندی هاوبەشی ستراتیژیك ئەنادۆڵ و میزۆپۆتامیادا ببینێت. یەك بەبێ ئەوەی تر ناتوانێت بکات. پەیوەندی ئابووری ـ سیاسی بەخێرای یەکگرتن دروست دەکەن. سەدەی سەرنجڕاکێش لە عوسمانیەکاندا ئەو راستیە مێژوویە سەرلەنوێ خۆی دەسلمێنێتەوە.

لە قەوارەی نوێدا گرانای بەگە کوردە سونیەکان، لەناو ئیمپراتوریەتدا زیاتربوو، رەوشی کوردی عەلەوی و ئێزیدی و بەشە کرمانجە کە کێشەکانیان سەختتردەبن، ناکۆکی و چینی و ئاینزای زیاتردەبن. ئەو قەوارە هاوبەشەی کە"300"ساڵ بەردەوام بوو، لە سەرەتای سەدەی"19"دا بەهاتنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بۆ رۆژهەڵاتی ناوین، بەرەو خراپبوون چوو. ئیمپراتوریەتی بەریتانی کە لەڕێگای عێراق و میسرەوە کاریگەری خۆی لەسەر ناوچەکە زیاد دەکرد، هەوڵیدا کە مللیگەرایەك لە سلێمانی پێشبخا. راپەرینی سەرەتا لە ناوچەی سلێمانی لەلایەن سەرکردەکانی خێڵی بابان وە ئەنجامدرا.

ئەو قۆناخە نزیکەی"200" ساڵ بەشێوەی جیاجیا بەردەوام دەکات، بە بەڕێوەچوونی نیو دەوڵەت ـ نەتەوە ئەمڕۆ لە باشوری کوردستان بەڕێوەدەچێت. راپەرینی کوردان لە سەدەی"19"دا، لەبەر تایبەتمەندیە چینایەتیەکان، مللیگەرای سەرمایەداری سەرەتان. سەرەڕای ئەوەی هەموو میللەتەکانی لەدەوروبەری ئیمپراتوریەتدا لەسەر بنەمای دەوڵەت ـ نەتەوە جیاش ببنەوە، جیابوونەوەی تورك و کورد وەکو دەزانرێت هۆکاری مێژووی هەیە. زهنیەتێکی دەوڵەتگەرا کە سەرچاوەی خۆی لە هاوبەشایەتی لە توێژی سەرەوەی هەردوو نەتەوەدا دروستبووە و کاکلەی دەوڵەتی ئیمپراتوریەتە، جێگای قسەو باسە. هۆکارە ستراتیژەکان، لەکاتی دروستبوونی دەوڵەت تا ئەو کات، هەر شارستانیەتێك کە لەنێوان هەردوو گۆڕەپاندا پێشبکەوێت، پێویستە کە پێکەوە جموجۆڵ بکەن. ئەگەر وانەبێت ئەوا هەبوون و بەرژەوەندی هەردوو گۆڕەپانەکە بکەوێتە مەترسی. هەر پێکهاتێکی سیاسی و ئابووری کە دەربکەوێت، بەهای بێ رادەی لە حاڵەتی هاوبەشبووندا گوزارە دەکات.

ئەزمونی سوڵتانی سەلجوقی و عوسمانی تورك، ئەو دیالیکتیکە مێژوویە جارێکی تر پشتڕاستی دەکاتەوە. ئەو هاوبەشیەتیەی لە سەرەوە لەنێوان بەگ و سوڵتانەکاندا، لەناو کاتدا گۆڕا بۆ پەیوەندی نێوان شێخ و ئاغا و بازرگانەکان. لەگەڵ سوڵتان مەحمود لە"1808 ـ 1839" ئەو پەیوەندیانە هێشتا زیاتر خراپبوون. کاریگەریە خراپەکانی مۆدێرنیتە، ناکۆکی لەنێوان هەردوو لایەنەندا زیادکرد، ئەو سەدەیەی لەسەرەتاوە هەتا کۆتای گۆڕی بۆ سەدەی سەرهڵدانەکان. بێ ئەنجام بوونی سەرهڵدانەکان و هەوڵدان بۆ سەرلەنوێ دروستکردنەوەی ئیمپراتوریەتی عوسمانی کە بەرەو دەوڵەتگەرای ـ نەتەوەی دەچوو، وایکرد کە تایبەتمەندی نەریتی باوی پەیوەندیەکان لە نێوان هەردوو میللەتدا خراپ ببێت. عوسمانیە گەنجەکان، ژۆنتورك و باڵی هەرە مللیگەرا جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقی"1889" سەرەتا بەشێوەی شاراوە پاشانیش بەکراوەی دەوڵەتگەرای ـ نەتەوەی تورکی پاراست، ئەو پچڕانە هێشتا زیاتربوو. لەبەرامبەر ئەمەشدا مللیگەرایی کوردیش خۆی نیشاندا. بەواتای مۆدێرنیزم کێشەی کورد لەم کاتەدا دەستپێدەکات. دەستپێکردنی کۆمیتەگەرایی جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقی و لەجیاتی مللیگەرای ئیسلام، بەکراوەی بەرەو تورکپەرستیەتی چوون، ئەو کێشەیەی هێشتا زیاتر سەختترکرد. دوو بەش دروستبوون: مللیگەرای تورك و مللیگەرای ئیسلامی. کورد ویستیان کە یەکێتیەکەیان بە نەریتی مللیگەرا ئیسلامیەکان بەردەوام بکەن. وەکو شەپۆڵی سەرەکی شێخە نەقشبەندی، مەولانا خالید و

سەعید نەورسی نوێنەرایەتی ئەو نزیکبوونە دەکەن. جغتیان دەکردەوە لە تایبەتمەندیە هاوبەشەکانی ئیمپراتۆریەت و دامەزراندنی دەوڵەت دوای ئەوانیش. ئایدیۆلۆژیای ئیسلام، ئوممەت مۆدێرێن دەکرا بۆ ئەو مەبەستە بەکار دەهات. دوای بەگەکان"1878" شێخ و شەیۆڵەی تەریقەتەکان کە کاریگەریان و رۆڵیان بۆ رێبەرایەتی کردنی کۆمەڵگا زیاد دەبوو، ئەو هێڵە هەتا رۆژی ئەمرۆشمان بەردەوام دەکات.
جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقیش، بەتایبەتی دوای شکانی لەشەڕی بەڵکان لە"1912 - 1913"، بێ ئەوەی هاوبەشایەتی مێژووی نێوان ئەنادۆڵ و میزۆپۆتامیا تەماشابکەن، لەناو دەوڵەتدا بەرەو مللیگەرایەکی رەگەزپەرست چوون. لەم مللیگەرایەتیەدا شوێن بۆ کوردان نەبوو. یان ئەوەتا وەکو ئەرمەنیان واز لە خاکەکەیان بێنن، یان ئەوەتا بەشێوەێك لە شێوەکان لەناو ببردرێن. ئەوەی ئەو سیاسەتەی بەرەو پێشەوە دەبرد پۆزەتیڤیزمی فەرەنسایە. تەنها ئەوەی بەهێزبوو مافی ژیانی هەبوو. دەتەرمینیزم"قەدەرگەرا"ی داروین"ئەوەی بەهێز دەتوانین بژی"وەکو خۆی، وەکو راستیەکی زانستی، دەخوازرا لەسەر کۆمەڵگا پێکبێت. دڕندایەتی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری، لێرەدا خۆی بەهەموو دڕندایەتیەکەوە نیشاندەدات. هەر بەتەنها بۆ ئەرمەنی، رۆم، سوریانی و کوردان نا، بەڵکو ئەو ئایدیۆلۆژیا پۆزەتیڤیستە توندوتیژە ئاستی تورك و عەرەبیشی هێناوەتە رەوشێك کەناتوانن تیایدا بژن، بەدەستی جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقی دوای بەئیمپراتوریەت هات. بەڵام کاریگەریەکانی لە تورکیای کۆماریشدا، هەژمونگەرایەکەی بەردەوام بوو.
تایبەتمەندی ژاکۆبەنێکی شۆڕشی کۆمار ئەو هاوپەیمانیەتیەی پشتی پێ دەبەست، رێبەرایەتی مستەفا کەمال کە لە بەشی سەرەتا هەڵسەنگێنرا پێویست بە دووبارەکردنەوە ناکات. وەکو هاوپەیمانەکانی تر کوردیش رەگەزێکی دامەزرێنەری کۆماربوون. وەکو لە مێژوودا روویداوەو دیسان وەکو هاوکاریەکی ستراتیژی، چ لە رزگاری ئوممەت و چ لە ئاواکردنی کۆماریشدا شوێنی خۆیان گرتووە.
لەسنورەکانی میساقی مییلیدا کە لە بەرامبەر موسڵ و کەرکوك لە ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا مابووەوە، کاتێك بەجێبوونی دەوڵەت ـ نەتەوە وەرگیرا، هەم کورد کرانە چوار پارچە، هەمانکات ئەو پارچەیەی لە ناویشدا مابوو، لەسەری سیاسەتێك بۆ لەناوبردنیان بەخێرایەکی سەرەنجراکێش دەستپێکراو ئەو سیاسەتە هەمیشەو بەهەمان خێرای بەردەوامبوو.
لەم نێوەدا ئەگەر ئێمە دیاری بکەین کە پەیماننامەی قەسری شیرینی ساڵی"1639" کەلەگەڵ خانەدانی سەفەویدا ئەنجامدرا، لە دژی هاوپەیمانیەتی ستراتیژی نێوان دوو میللەتان دابوو. بەگشتی هەموو کورد لەناو سنوری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دابوون. بەدڵنیایەوە سنوری میساقی میللی لەسەر بنەمای پێکەوەبوونی کورد و تورکدا دروستکرابوو. ئەو رێکەوتنەی کە لەگەڵ ئینگلیز و فەرەنسیەکاندا ئەنجامدران بەدڵنیایەوە لەدژی میساقی میللی بوو. ئەو رێکەوتنانەی کە کورد لەگەڵ کێشەی هەبوون و نەبوونی سەخت کە ئەوان بە مێژووەوە کلیلدەدا، بەدڵنیایەوە لەدژی هاوکاری و برایەتی هەزاران ساڵەی نێوان کورد و تورکە کە زۆر باسدەکرێت. بەڵام ئەو پرسیارەی کە ناکرێت، لەو رێکەوتنە دژبەرانە کێ بەرپرسیارە. لەلایێك تۆ کورد لەئەنجامی پەیوەندی لەگەڵ هەندێك هێزی هەژمونگەرا، لەبەرامبەر ئەو سازشانەی کراون بیانکەی بە چوارپارچە، لەلایەکی تریش بڵێیت" هەندێك کورد برایەتی هەزاران ساڵە خراپ دەکەن !" ئەو نزیکایەتیە ئەوەندەی گاڵتە جاڕیەو نایەوێت راستیەکان ببینێت، لە مێژووی کۆماردا تا رۆژی ئەمرۆ کێشەی کورد هێنایە بەردەم لەناوبردنی کلتوری.
کێشەی کورد بەڕاستیش لەبەر هۆکاری چەمك و پێکهێنانی رۆحی دۆستایەتی ستراتیژی هەزاران ساڵە بەتەواوی دەخرێتە لایێکەوە، نکۆڵی لێ دەکات، بەتەنها لە کێشەی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی و سەربازی دەرخرا، گۆڕا بۆ مەسەلەی هەبوون و نەبوونی کلتوری میللەتێك. هەروەکو راپەرینەکانی"1925 - 1940" سەرچاوەی خۆیان لە کێشەی هەبوون و نەبوونەوە وەرگرت، بەو مەبەستە بەکاریش هاتن. ئاشکرایە کە زهنیەتی ئیتیحادگەرا دەیوویست کوردان هەم لە دەوڵەت و هەمیش لە کۆمەڵگای دووربخا، لەکۆمەڵگابوونی دەردەخست و ئەوەشی بەسەردا دەسەپاند. لەبەر ئەوەش ئەو سیاسەتە بەساڵان گۆڕا بۆ کێشەی" کورد هەیە یان نییە؟" بەردەوامبوو. دەرخستنیان لە رەگەزی دامەزرێنەری کۆمار، خستنیان بۆ ناو قۆناخی لەناوبردن چەندەی بەرێوەبردنێکی دڕندانەیە، پێویستە مرۆڤ بەکەمێك خۆخستنە شوێنی ئەوانەوە"ئەمپاتی" لێی تێبگات. کێشەی کورد کێشەی جیابوونەوە نییە، کێشەی لە قۆناخی لەناوبردن دەرکەوتن و دووبارە گەیشتنەوەیە بە ئاستی دۆستایەتی، هاوبەشایەتی و برایەتی ستراتیژی کە بەگوێرەی شایەستە بوونی مێژووە. تێگەیشتن لەم راستیە تەنها دەکرێت بەدەستەواژەی خۆ خستە شوێنی ئەوان"ئەمپاتی" بەویژدانەوەیە.

ب ـ چەقبەستکردنی پرۆژەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بۆ کۆمار و دەرخستنە پێشی ئەوەی "PKK"
ئەو هێزانەی لە ئاواکردنی کۆماردا رۆڵێکی سەرەکیان بینیوە، نوێنەرایەتی رێکەوتنێکی دیموکراتیان دەکرد. رێبەرایەتی مستەفا کەمال، هەم هۆکار و هەمیش ئەنجامی ئەو رێکەوتنەیە. دەستوری"1921" یەکەمین پێکهاتەی ئەنجومەنی نوێنەرانی تورکیایە و ئەو رێکەوتنە زۆرباش دەستنیشان دەکات. هەبوون و پاراستنی ئوممەتی ئیسلام زۆر ئاماژەی پێدەدرێت، دیاری دەکرێت کە تورك و کورد دوو رەگەزی سەرەکی ئوممەتن"ئوممەت بە عەرەبی بەواتای میللەت دێت"، دژ ـ ئیمپریالیزم و باسی دۆستایەتی سۆڤیەت دەکرێت. لە بەڵگەکانی ئەنجومەنی نوێنەراندا مرۆڤ راستی زۆرێك لەو دیاریدانە دەبێت. سۆسیالیستبوون و کورد و کوردستانی بوون بەسروشتی پێشوازی لێدەکرێت. ئاشکرایە کە هۆکاری شۆڕشی ژاکۆبەنیکی کۆمار، گوزارشت لە رێکەوتنی گشتی کۆمەڵگا دەکات. لەم کاتەدا ئیمپراتوریەتی بەریتانی ئامانجی سەرەکی بوو. بەڵام کاتێك بە شۆڕش رێگا لە داگیرکەریگیرا، بەرەو هەوڵدان بۆ سیستەمێکی نوێ دروستبوو، گروپێك

لە لاینگرانی ئیمپراتۆریەتی بەریتانی کادیرە ئیتیحادگەراکان، چ لە ئالۆزیەکەی شێخ سەعید،چ بەزۆرێك لە گەلەکۆمە و ئالۆزی و هەوڵدەکانیان لە بەرامبەر مستەفا کەمال هەتا هەوڵی کوشتنیشی لەناودا، لە ساڵی"1925" بەدواوە قۆناخێکی گرنگی تێپەڕاندوە. ئەو گرووپە لەسەردەمی سەرۆك وەزیرایەتی عیسمەت ئینینۆ هێشتا زیاتر بەهێزبووە. ئینجا پێش نزیك بوونەوەی لەمردنی مستەفا کەمال پاکتاوکردنی عیسمەت ئینینۆ، ئەوا زۆر لە ئەنجامەکان نەگۆڕێت.
دوای شەڕی جیهانی دووەمین، هەژمونگەرایی جیهان کەوتە دەست ئەمریکا، کاری ئەو گرووپە هێشتا ئاسانتر بوو. سەرەڕای هەموو تێروانینە بێلایەنەکانی عیسمەت ئینینۆش، نزیکی ئەو گرووپەیە. خۆی لە خۆیدا پەیوەندی ستراتیژی لەگەڵ ئەمریکا بەرێبەرایەتی پارتی دیموکراتە، رێبەرایەتی عیسمەت ئینینۆ ئەوەی جێبەجێکردوە. هێشتا بەر لەوەی بەشداری ناتۆ بێت، گرووپێك ئەفسەر، سەرەتا تورکیا رەوانەی ئەمریکایان کردن و پەروەردەکران. پەیوەندی لە سەردەمی پارتی دیموکراتی هێشتا خێراتربووە. لەساڵی"1952"دا، لە زەمینەی سوپادا یەکسەر بەپێشەنگایەتی ئەمریکا گرێدراوە بە ناتۆ، رێکخستنی گلادیۆ دروستکراوە. لەتورکیا گلادیۆ سەرەتا خۆی وەکو دەستەی تەدقیقی هەمەلایەنە رێکخستوە. دارای و بەڕێوەبەرایەتیەکەی لەلایەن ئەمریکاوە جێبەجێکراوە. لەو ساڵانە بەدواوە رێکخستن لقەکانی خۆی بڵاوکردۆتە، گۆڕپانی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، سەربازی و کلتوریشی لەناودا، لەهەموو گۆڕەپانەکاندا خۆی بەرێکخستنکردوە. وەکو ئەوەی هەموو پارتی سیاسی کۆنترۆڵ کردبێ، چینی کرێکاریش لەساڵی"1952"وە لە تورك ـ ئیش ئەوەی لە گلادیۆوە هاتۆتە دامەزراندن، لەژێر کۆنترۆڵ دایە. لەسەر پارتی کۆمەنیستیش کە درێژکراوەی سۆڤیتە لەگەڵ سەندیکاکان فشارێکی بێ رادە بەڕێوەبردن. خۆی لە خۆیدا مەبەستی سەرەکیان، کاتێك جولانەوەیەکی کۆمەنیست و سۆسیالیستی هەرە بچوکیش دروستبووە، یەکسەر لەناویان بردوون. کوردایەتیش ئەوەندەی پەیوەستی کۆمەنیستی کراوە، رووبەڕووی هەمان سەرئەنجامیش کراوەتەوە. لەم نێوەدا، لەگەڵ ئیسرائیلیش کە تازە دامەزراوە، پەیوەندی ستراتیژی و شاراوەش بەڕێوەدەچوون. لە ناو کوردانیشدا بە بنەماڵە و کەسایەتیە باو ئاینیەکان و مللیگەرای سەرەتایش، بەشێوەی گلادیۆ ئاسا پەیوەندی پێشدەخران. بە رژێمی پاشایەتی عێراق و ئێرانیش هەمان پەیوەندی دروستدەکران. "سەنتۆ" وەکو رێکخستنی چەتری ئەو جۆرە پەیوەندیانەیە. ویسترا لە رۆژهەڵاتی ناوین بەم مۆدیلە رێگا لە کۆمەنیزم بگیردرێت.
ئاشکرایە کە ئەو مۆدێلە بە رێبەرایەتی ئەمریکا پێشدەخرێت، شێوەی نوێی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری کەدوای ساڵانی"1950" بەشەڕی سارد وەرگرتووە. کۆماری تورکیا، لە ئاواکردنی ئەو مۆدێرنیزمەی کە بە ئەمریکا خۆی نوێ کردۆتەوە، سەرەتا لە وڵاتی خۆیان و پاشانیش لە رۆژهەڵاتی ناوین خاوەن رۆڵێکی سەرەکییە. ئەو مۆدێرنیتەیی کە مستەفا کەمال دەیەویست بەڕێوەی ببات جیاوازبوو. نزیکی شێوازی سۆڤیەت بوو و پشتی دەبەست بە دۆستایەتی ستراتیژی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت. تاکو ئێمە جیاوازی نێوانیان نەبینین، ئێمە ناتوانین ساڵانی"1950"و هەتا ئەو رەگەزانەی لە مۆدێرینیتەی دوای ساڵی"1925" کە لەگەڵ مستەفا کەمال پێشخراوە شیکاری بکەین. رەگەزی دەوڵەتگەرای ـ نەتەوەی، سەرمایەداری و پیشەسازیگەرایی، لەنێوان پێکهێنانی هەردوو مۆدێرینیتەکاندا، هەوڵە هەمەڕەنگیە چینایەتیەکان، سیاسی، دیبلۆماسی و ئابووری جدی هەیە. لە ئەنجامدا ئەو تێکۆشانە هەژموونگەرایەی قازانجیکردوە، سەرەتا ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا بووە پاشانیش ئەمریکایە. بە شێوەیەکی وایە کە لەنێوان هەردووکیاندا بەردەوام پەیوەندی ستراتیژی لەئارادان. ئەو مۆدێرنیزمەی کە جێبەجێدەکرێت، بە پاکتاوکردنی رێکەوتنی دیموکراتی کۆمار نەوەستاوە، ئەو شەڕەی کە لەبەرامبەر هەمووان‌دا دەستی پێکردوە، هێزە هاوپەیمانە سەرەکیەکانی، کردۆتە دوژمنی یەکتر. ئەو خاڵەی کە لەتێگەیاندنی ئەوەی بەرامبەردا مستەفا کەمال زەحمەتی پێوە بینیوە ئەمەبووە. لێرەدا رۆڵی لەژێر کاریگەری قووڵی ئایدیۆلۆژیای پۆزەتیڤیستدا هەیە. حەزکردنی لە ئازادی و سەربەخۆیی، رێزی بێ رادەی لە بەرامبەر کلتوری هەرێمی و کلتوری ئەنادۆڵ، هەرچەندە بۆ پۆزەتیڤیزم هێشتا رۆڵی شێواندنی نەبینیبێت و کاریگەری لەسەر هەبێت، نەی توانیوە کاریگەریە سەرەکیەکانی ئاستەنگ بکا.
دۆگماتیزمی پۆزەتیڤیست کە لە شوێنی دۆگماتیزمی ئاینی بەجێیان کرد، هێشتا لەسەر بەشی مللیگەرای عەلمانیدا خاوەن کاریگەریەکی قووڵە. پێچەوانەی باوەڕدەکرێت، عەلمانیەت کۆماریگەریەکی دیموکراتیە، هەتاکو کۆمارگەرا نییە، دەسپۆتیك و دیکتاتۆریەتە. پێکهێنانە بەرچاوەکەی ئیتیحادگەراکان ئەوەندی کاریگەریشیان لێکردوە "CHP"گەریەتیە. ئەو تێزەی کە فەیلەسوفی مافناسی و سیاسی کارڵ سیچمینت کە لە ئەلمانیا لە ساڵەکانی "1920 ـ 1930"کان لەسەر زانستی ئاینی سیاسەت پێشخستووە، بۆ تورکیا هێشتا زیاتر گونجاوە. وەڵامی هەموو چەمکە سیاسیەکانی مۆدێرینیزم، لە تیۆلۆژیای چاخی ناوەڕاست، هەتا بەگوێرەی من لە چاخی سەرەتاشدا هەیە. ناوەندەکەی سومەرە. ئەوەی پۆزەتیڤیزم کردویەتی، ئەو چەمکانەی بە بۆیاخی مۆدێرینیتە بۆیاخکردوە، بەناوی"زانستیبوون" خستوویەتیە بازاڕەوە و بەناوی سەرمایەداری پێشکەش دەکات. گومانەکانی مستەفا کەمال، ئەو رەوشە رۆحیە ئالۆزەی کە هەیەتی، تاکو بەیانی خوێندنەوەی پەرتووکەکانی دەربارەی شارستانیەت، تاکو فرمێسکی لە چاوان دێن، ئەگەر مرۆڤ لە ناکۆکی و وێکچوون لە بابەتی دۆگماتیزم و پۆزەتیڤیزم و ئایندا بگەڕێت، ئەوا هێشتا راستر و روونتربێت.
زۆر گرنگە مرۆڤ هەموو کادیرە نوخبەکانی کۆماری تورکیا ببینەو تێبگات کە لە بابەتی مۆدێرینیتەدا لەناو نەزانیەکی قووڵ و بێ باوەڕدا ژیان دەکەن. بۆ هەموو دوالیزمێکی وەکو راستگەر ـ چەپگەر، عەلمانی ـ ئاینی، عەلەوی ـ سونی، تورك ـ کورد ...هتد، ئەو رەگەزە بۆ هەموویان دەشێت. لەسەردەمی کۆماردا شەڕی لەنێوان ئومەتگەرا ئیسلامیەکان، سۆسیالیست، مللیگەرا کوردەکان هەتاکو بەشێکیش لە مللیگەرا تورکەکانیش رەگەزەکانی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری چۆن پێشدەخرێن و ئاراستەدەکرێن هێشتا شیکار نەکراوە. بەتایبەتی بە ئاراستەکردنی گلادیۆ لەلایەن ئەمریکا، ئەنجامی زۆر خراپی لەگەڵ خۆی هێنا. چەمك و رێکخستنبوون و کۆمیتەگەرای کودەتاچیەکانی سەدان ساڵەی ناو دەوڵەتدان، تاکو

پەیوەندیەکانی ئەوان بە ڕەگەزەکانی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری ڕوون نەکرێتەوە، نە قەیرانی دەوڵەت نە کۆمەڵگا، لە ئالۆزی و شەڕەکانیان تێناگەی. ڕوونکردنەوەی ڕۆڵی پەیوەندیەکان لەگەڵ هێزە هەژموونگەراکانی سیستەم، بەتایبەتی لەگەڵ بەریتانیا و ئەمریکا لەناو ئالۆزی و شەڕەکاند، چ لەدیموکراتی بوون و چ لە چارەسەرکردنی کێشەی کورد دا خاوەن ڕۆڵێکی ژیانییە. تێگەیشتن لە هەموو هەوڵەکانی سەربەخۆی و ئازادی مستەفا کەمال و ئەوانەی کە دڵسۆزیەکەیان لەخۆیاندا بە ڕوونی نیشاندەدا، بۆ بەتاڵ مانەوەو ئەنجامی پێچەوانە دەرکەوتن، تەنیا بە تێگەیشتن لە پرۆژەی مۆدێرینیتەی کۆماردا کامە هێز لە دەرەوە لەناوەوە کاریگەربوون، هەژموونگەرا ئایدیۆلۆژیەکان کە پێیەوە پەیوەستن، دەکرێت پێکهێنانە ئابوری، سیاسی، کۆمەڵایەتی و سەربازیەکانیان جێبەجێ بکرێت. کودەتا سەربازیەکان و درێژکراوە سیاسیەکانی، بە ئالۆزیەکانیانەوە گرێدراو بە هۆکار ـ ئەنجام بەولاتر خاوەن هیچ ڕۆڵێکیتر نەبوون. هەموو هەوڵدانەکانی ئەوان بۆ ڕزگارکردنی ڕەوشەکە سەختترکردوە، ئەوەش دەستنیشانکردنێکی هاوبەشی کۆمەڵناسیە.
پرۆژەی مۆدێرینیتەی کۆمار، هێشتا هەر لە سەرەتادا بەچەوتی دروستبووە. ئەو چەوتیە پێویستە بەپێداگریەوە دەستنیشانبکرێت، ئەو ڕەگەزانەی هێزە سەرەکیەکانی کە ڕزگاری بەدیهێنابوون و کۆماریان دروستکردبوو، لەگەڵ کۆماردا خستنە ناو ناکۆکی و لەگەڵ هەمووانیشدا خستنە ناو شەڕ. ئەگەر ئێمە بە ریز دیاری بکەین، ڕێز کردنی ساڵەکانی"1925 - 26، 1930، 1937 - 38، 1945 - 50، 1960، 1970، 1980، 1997، 2001 - 2002 یانیش چەوتی لە ناوەڕۆکدا بەشێوەیەکی ئاشکرا نیشاندەدات.
لە ماوەی نێوان"1965 - 1980" ڕەگەزە سەرەکیەکانی دامەزرێنەری کۆمار ویستیان خۆیان سەر لەنوێ ڕابگەێنەوە. بەبێ ئەوەی بەرە هێزی هەژمونگەرای باو کە لە بەرامبەریانە، ئۆلیگارشی لە ئاستی پێویستدا بناسن و شیکاری بکەن، بەهەڵوێستی تەنگ کەوتنە ناو بەدواداچوونی مانەوە. وەکو زۆر بانگێشەی بۆ دەکرێت، لە ڕەوشێکی وادانەبوون کە بتوانن شۆڕش یان دژە شۆڕش پێکبێنن نەبوون، بەڵام بەم شێوەیە پێناسەکران. کاتێك سەریان هلدا، بەشێکیان لەناوبردران و ئەوانەی مانەوەش کەوتنەوە ناویان و ماڵی کران. چەند جێگای نیگەرانیە ئەو هێزانەی لە بەرامبەر یەکتری بەکارهاتن، دووربوون لەتێگەیشتنی ڕۆڵی گلادیۆ. هەڵبەتە لێرەدا جیاوازی لە نێوان ئەوانەی بەباوەڕیەکی پاك بۆ ئازادی و سەربەخۆی و یەکسانی خەباتیان دەکرد و ئەوانەش لەدژیان بوو جێگای قسەکردن لەسەر نییە. بەڵام پەیوەست بوونیان لەگەڵ کودەتاکانیش ڕاستیەکە. لەو کاتەدا پەیوەندی ڕێکخستنە مللیگەرا و ئاینگەراکان لەگەڵ تاکتیکەکانی گلادیۆی دژە کۆمەنیست، هێشتا بەرچاوترە. کاریگەری ئەو هێزانە لەسەر ژیانی ئابوری و کۆمەڵایەتیش گرنگە. ئەوەی لەسەر هەموو گۆڕەپانەکانی ژیان خاوەن ڕۆڵە، بەڕێوەبەرایەتی سەرەوەی گلادیۆی مۆدێرینیتەی سەرمایەداریە. لێرەدا کۆنترۆڵ لە سەر سوپا و پێکهاتە سیاسیەکان لەسەرووی هەموویانەوە دێن. بەو شێوەیە بەکارهێنانی بەڕێوەبەرایەتی کۆمار، ئاشکرایە وەکو بەردەوامکردنی کۆمیتەگەری ئیتیحاد و تەرەقیە. بۆ پووچەڵ کردنەوەیان، هەوڵەکانی م. کەمال بەشی نەکردوە. هەتا نەریتی باوی کۆمیتەگەرایەتی کودەتاچی، لەژێر کۆنترۆڵی گلادیۆدا دەربازنەکرێت، تایبەتمەندی دیموکراتی و حقوقی، سیستەم و جێگیرکردنی کۆمار ناتوانرێت پێکبێت.
لەگەڵ دەرکەوتنی"PKK" ئەو پێکهاتەی کۆمار کە چەقبەستبووە و کێشە بەرهەم دێنێ، ڕۆڵێکی بەرچاوی بینیوە، ئەمەش لەژێر ڕووناکای ئەو شیکردنەوانەدا هێشتا باشتر دەتوانین لێی تێبگەین. ساڵانی"1970" بەڕاستی کاتێك بوو کە جولانەوە دیموکراتیەکان هێزیان بەدەستخستبوو. کودەتای"12 ئادار" خاوەنی ئەو هێزە نەبوو کە بتوانێت ئەو قۆناخە بووەستێنێت. هێزەکانی کۆمەڵگا کە لە دامەزراندنی کۆماردا بەکاریگەربوون، سەرلەنوێ دەردەکەوتنەوە سەر سەکۆی مێژوو؛ سۆسیالیست، ئیسلامگەراو مللیگەرا کوردەکان لەناو کۆمار بۆ خۆیان لە هەڵسانەوەێك دەگەڕان. بارگاویبوون بەداخوازی دیموکراتی. ئەگەر ئەو داخوازی بە کودەتا و هەڵسوکەوتی فاشیستیانە نەچەوسێنرابووایەوە، بەڕێگای دیموکراتی دەیتوانی بگاتە چارەسەری. بەڵام ئەو قەیرانەی لە نێوان ڕەگەزەکانی شەڕی سارد و مۆدێرینیتەدا بەڕێوەدەچوو، بە ڕێگای هێشتا دژوارتر تا دەچێت فاشیستر دەبێت، بەردەوامکردنی باش بینرا. کۆماری تورکیا بووە ئەو وڵاتەی کە کۆنترۆڵی گلادیۆ بەشێوەیەکی زۆر قووڵ تیادا جێبەجێبکرێت. ڕژێمی"12"ئەیلول وەکو نمونەیەکی ئەو کۆنترۆڵە زۆر مەترسیدارە پێشکەوت.
بەتەواوی ڕێگری نەکردن لە"PKK" پەیوەست بوو بە پێکهاتەی ناوخۆی کورد و ئالۆزی ڕۆژهەڵاتی ناوین. لە ڕاستیدا کودەتای "12" ئەیلول لەماوەی"24"کاتژمێردا هەر شوێنێکی پاککردەوە. بەهەڵە چوونی لە بابەتی کوردا، هۆکاری کۆمەڵایەتی قووڵ هەبوون. وەها باوەڕدەکرا کە کورد وەکو کۆمەڵگا و گەل لەناوچووە. دوای ڕێگا گرتن لە سەرهلدانەکان و قۆناخێکی توانەوەی زۆر سەخت دەستی پێکرد، وا دەزانرا جارێکی تر کورد ناتوانن بێنەوە سەر هۆشیان. بەتایبەتیش لەسەرووی هەموویاندا ئەو بیرۆکراسیەتەی کە لە سەر بنەمای ڕەگەزی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری بەرەو پێشەوە دەچوو و چینی ناوەڕاست، ئەو هزرە کۆمەڵایەتیە نوێیە، کوردیان وا دەژمارد وەکو ئەوەی لە مێژوودا سڕاوەتەوە. ڕۆڵیان لە مێژوودا لە بیرکرابوو. ئەوانەی هەشبوون دانە دانە، وەکو گیانەوەری کێوی دەبینران. توێژی سەرووش بە هەڵوێستی لە پاشا هێشتا پاشاتر، لە بینینی ڕۆڵی خوڵامیەتی دەسەڵاتداریەتی بەردەوامبوون. ئەو ڕەگەزە مللیگەرا و تەریقەتانەش کە لەگەڵ ئەمریکا لە ناو پەیوەندین، پەیوەست بوونیان بە بەرخودان و ئازادی زیاتر، لە زەمینی دژایەتیدا دەجولانەوە. "PKK" لەناو ئەو هەلومەرجانەدا، هەرچەندە ڕاستی خراپکردنیش هاتبێت، لەگەڵ بەشی کرمانج ئەوانەی گوند و شاری هەژارنشین کە وەکو هێزی کۆمەڵگای کوردبوون، دەیتوانی پەیوەندی دروستبکات. لە هەستی وڵاتپارێزی و کوردایەتی، لە پێکهاتەی کلتوری سوودمەند دەبوو، هەتاکو لە نوێ وە دەی ئافراندەوە. سەرەڕای هەموو چەوسانەوەو پارچەبوونی خۆشی، سروشتی کۆمەڵگای کوردی لەگەڵ خۆیدا پێکهاتەکەی دروستکرد. ئەوەی پێویستە هەستی وڵاتپارێزی لە ئاستی هەرە کەم و هەندێك زانابوونی بە چەمك بوو. لە"PKK"ی

ئەو کاتەدا، ئەو سۆز و چەمکە بەکاریگەرانە، لە ئاستێکدا کە بەشی دەکرد هاتبوونە ئاواکردن. ئەوەی بۆی پێویست بوو، نەکادیری دیبلۆماسی و سیاسی سەروو، بەڵکو ئەو سۆز و چەمك بە خێرایەکی بلند بەرێکخستنکردن بوو. چەند چالاکیەکی بەسنور ئەو خێرایە بە ئاسانی پێکدێنا.
لەدەرکەوتنیدا لەساڵانی"1970" هەتا سەرەتای ساڵانی"1980" بەو شێوازە پێشکەوتبوو. بەکارهێنانی هێزی بێ رادە لەلایەن رژێمی"12"ئەیلول، زوو داپڵۆساندنی هێزە چەپگەر و بەرهەڵستکارکانی تر و راستینەی زیندانی دیاربەکر و بەجێبوونمان لە رۆژهەڵاتی ناوین گەیشتنە یەکتری، ئەو کاتەی کە پێشی دەگوترێت قەڵەمبازی "15ی ئابی 1984"یش دەستپێکردنی سەخت نەدەبوو. لە راستیدا ئەو ماوەیە دەتوانرا لە"1982"دا دەستپێکرابوایە. لەبەر ئەوەی هەندێك لە رەگەزەکان لە شاخ ئەرکەکانیان بەشێوەیەکی شایستە جێبەجێنەکرد، وای کرد کە ئەو هەنگاوە تا"ئابی 1984" دواکەوێت. شەڕی ئێران و عێراقیش پشتیوانی دەدایە ئەو چوارچێوەیەی کە گونجاوبوو. بەڵام هیچ کاتێك جولانەوە لە کوردستانی تورکیا کەم نەبوو، بەردەوام هەبوونی خۆی پاراست. ناتوانین باسی گەریلایەتیکی زۆر شارەزابکەین. کاراکتەری گەریلایەتیمان دروستکرد. قازانجی"15ی ئاب" کە بۆ دەوڵەت قەڵەمبازێك بوو چاوەڕێی نەدەکرد، زۆر بەخراپی بەکارهێنرا. سەرەڕای هەموو بەرهەڵستکاریەك و دەستێوەردانی دەوڵەتان و هێزەکانی کوردستانی عێراقیش، بەجێبوون لەرۆژهەڵاتی ناوین، بۆ بەردەوامکردن بە بزووتنەوەکە بەشی پشتیوانی هەموو بەشەکانی کوردستان و کوردانی ئەوروپاشی دەکرد.
کاتێك شێوازی دەستێوەردانی رژێمی"12"ئەیلول لەلایەن ئەوانەوە ئەنجامدرا، بەپشتیوانی ناتۆ دەربازی سەردەمی باری نائاسایی و ژیتەم ببن. گلادیۆی ناتۆ ئەوەی لەژێر سەرکردایەتی ئەلمانیادایە، لەساڵی"1989" بەدواوە بەشێوەیەکی بەکاریگەر کەوتبوە جموجۆل. گەلەکۆمەی پاپا و ئۆلف پاڵمە، ئەوەندەی لەناو پلانی گشتیشدابێت، بدەرکەوتنی گەریلا لە کوردستان پەیوەندی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بابەتی گفتوگۆیە. ماوەی نێوان"1973 - 1983"ی دەرکەوتنی "PKK"، لە ئاستێکدابوو کە لایەنی کاریگەری ئایدیۆلۆژی و سیاسی لە پێشینە بوو، لایەنی چەکداری رۆڵی لە دواوەی دەبینی. قەڵەمبازی"1984" لایەنی چەکداری خاوەن رۆڵێکی سەرەکی بوو، هەروەها پێشکەوتنە ئایدیۆلۆژی و سیاسیەکانیشی بەردەوامدەکرد. پێویست دەکات مرۆڤ لەسەر باری نا ئاسایی و ژیتەم باش بوەستێت. دەزانرێت کە لەناو بزووتنەوەو لەدەرەوەشی، زۆر چالاکی کە بێ ناوەڕۆکن پێکهاتوون. ئەو چالاکیانەی کە ژن و منداڵ لەیەکتری جیا ناکردنەوە، ئەوانەی پێویست نەبوون بە ئامانج بگیردرێن، نزیکبوونی مەزاجی بێ رادە و خاوەن دەرنەکەوتن لە بچوکترین ئەرکیش، دەتوانین لەم چوارچێوەیەدا بیژمێرین.
بەڵام ئەوەی جێی سەرسوڕمانیشە ئەوەیە هەرچەندە"PKK"ی وەکو شەیتانیش نیشانبدەن، ئەوەندەی تر دەبێتە خاوەن هێز. ئەوا تێنیبوونی قووڵی گەلی کورد نیشاندەدات. سەرەڕای بزاڤی کۆچپێکردنی گەورە کە لەسەر کوردان جێبەجێدەکرا، چەندین قات لە جێبەجێکاریەکان لەسەر ئەرکی، رۆم و سوریانی زیاتریش بێت، هەموو شتەکان لە خانەی "PKK"دا خۆی نیشاندا. هەڵبەتە لێرەدا مەرجە مێژووی و جوگرافیەکان بەکاریگەربوون. وەڵامدانەوەی داواکاریەکی مێژووی یان پاراستنی هەبوونی مێژووی و خاوەن دەرکەوتن لە ئابڕۆی مرۆڤایەتی، کاریگەریە ئاشکراکانی ئەو پێشکەوتنە بوون. پێویستە مرۆڤ هەنگاو و داخوازیە مێژوویەکان بۆخۆی بچوك نەبینێت.
ئەو سیاسەتەی سەرۆك کۆمار بەڕێز تورگووت ئۆزال، لەساڵی"1992" بەدواوە سەبارەت بەکورد چاوەڕوان نکراوبوو. ئێمە گرنگیەکەمان هەندێك درەنگ هەست پێکرد. بەمردنی ئەو چانسەی کەبۆ چارەسەری بەشێوەیەکی جدی دەرکەوتبووە روو پووچەڵکرایەوە، من لەلای خۆمەوە بەردەوام وەکو لەدەستدانێکی مێژووی یادی دەکەمەوە. دەتوانرا چانسی چارەسەری دیموکراتی کۆمار دروستببوایە، بەڵام بەگوێرەی من هەندێك هێزی گلادیۆ بە ئەنقست ئەو چانسەیان نەدا. کاتێك سەرفەرمانداری سوپای ئەو کات دۆغان گوورێش لە ئینگلتەرا دەگەڕایەوە"لە سەرەتای 1990دا"، قسەکەی کە وتی"گڵۆپی سەوزمم بۆ هەڵکراوە" بەشێك لەم راستیە نیشاندەدات. دوای مردنی تورگووت ئۆزال، کودەتاکانی تانسۆ چیللەر یەك لەدوای یەك لەناو سوپا و دەرەوەیدا گەلەکۆمەی بێژمارەی کرد، گرێ یەکی هەرە سەرەکی کە پێویستە شیکاربکرێت. سیخوڕایەتی تانسۆ چیللەر بۆ"CIA"بەڵگەدارە، بەشێك لەو گرێیە دەستنیشان دەکات. زۆر راستی، کوشتنی رۆشنبیر و پێشەنگەکانی ئەتاتورك چیەتی و کورد، بە هەزاران کوشتنی بکەری نادیار، چۆڵکردنی گوندان، زیادکردنی حیزبوڵا، بەگوێرەی من گەلەکۆمەی هەرە گەورەیە لەسەر کۆمار. کاتی م. کەمالی ساڵانی"1924 - 1927" گەلەکۆمەچیەتی و راپەڕینەکان کۆمار وەبیر مرۆڤ دێنێتەوە. لەو ساڵانەشدا رەگەزە دیموکراتە سەرەکیەکان کۆمار پاکتاودەکران. ئەو رەوشە هێشتا روون نەکراوەتەوە. بەڵام ئاشکرایە ئەوەی قازانجی کردوە ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا و مۆدێرینیتەی سەرمایەداریە. رۆڵی هەژمونگەرایی دەرەوە بەکرێگیراوەکانی لەگەڵ هەمان گەلەکۆمەیاندا، یاخیبوون و کوشتنەکان، لەگەڵ پاکتاوکردنی کوردان، چانسی چارەسەری دیموکراتی لە سەرەتای ساڵانی"1990"بێ ئەنجامکرا، پێویستە مرۆڤ بچوکی نەبینێت. نمونەی زۆر کەم هەیە ئەوەندە ئاڵۆزی، کۆمەڵکوژی، ئاژاوەگێڕی، بزووتنەوەی دیموکراتی کە لە ساڵانی"1993 - 1997" بەڕێوەچوون، کۆنترۆڵی هەژمونگەرا لەسەر کۆمار بەچە واتایەك دێت دەستنیشانی بکە.
ئێمە باسی کاتێکی زۆر سەیر و نمونەکانی کەم دەبینرێن، کە تایبەتمەندی دەوڵەتی یاسای، عەلمانی، کۆمەڵایەتی و دیموکراتی بەتەواوی پاکتاوکراوە، کەوتۆتە ژێر کۆنترۆڵی ژیتەم، خستنە ژێر پێکهاتەکانی قۆرخکاری رەگەزەکانی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری دەکەین. لە کۆتای ئەو ماوەیەدا بۆ دروستکردنی پەیوەندی لەلایەن سەرۆك وەزیر بەڕێز نەجمەدین ئەربەکانەوە بەرێگای سەرۆك کۆماری سوریا و لە سەر برۆکسلەوە لەگەڵ بەشێك لە سوپا بەناوی بەشی پەیوەندی کۆمەڵایەتی، وەڵامێکی گونجاو درایەوە. گفتوگۆی بە نامە و ئاگاداری دروست بووە. بەڵام بە لادانی نەجمەدین

ئەربەکان و دەرخستنی من بۆ رۆژهەڵاتی ناوین، ئەو هەنگاوە رووبەڕووی بنکەوتن و شکان کرایەوە. لەو باوەڕەدام لەم سەرنەکەوتنە پێویستە رۆڵی دەوروبەری گلادیۆی ناوخۆ و دەرەوە، پێویستە بچووك نەبیندرێت. دەیانتوانی ئەو قەیران و پێکهەڵپژان و شەڕەی لەئاستی خوارەوەی گەورە کە هێشتا کۆمار پیادا تێپەڕدەبێت و بەرێوەدەچێت، رێگای لێ بگیردرابوایە. چ ئاگربەستی یەکلایەن و چ رەوشی پەیوەندیەکان دەرفەتێکبوون بۆ هەندێ. رێگا لەم هەوڵانە گیردراو قۆناخەکە بەشێوەیەکی بەئەنقەست پووچەڵ کرایەوە. ئەو چانسەی چارەسەری کە هەبوو لەناوبردرا.
دوای ئەوەی دەرکەوتنم بۆ ئەوروپا و بەدواداچوونم بۆ چارەسەری سیاسی، بەشێوەیەکی زۆر ئاشکرا لە رێگای ئینگلتەراوە پووچەڵ کرایەوە. ئینگلتەرا کە لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی گلادیۆی ئەسینادا لەناو هاوکاریدابوو، بە فرۆکەیەکی تایبەت کە لەسویسرا هەڵیستاندوە و فڕاندنی من بۆ کینیا، ئەو راستیە زۆر باش دەستنیشان دەکات. بێگومان لە ئۆپەراسیۆنەکەدا هەموو دەوڵەتانی ئەوروپای ئەندامی ناتۆ هەبوون. بەڵام مێشکی بەڕێوەبەرایەتی ئینگلتەرابوو. ئەمریکا جێبەجێکاری لایەنی فەرمی بوو. ئیسرائیلیش لە ئاستی رێنیشاندان دابوو، ئەو هێزەی رێگای لەمانەوەم لەمۆسکۆ گرتبوو. لەراستیدا هێشتا زۆر بەر لەوە چ لە کینیا و چ هێشتا لە رۆژهەڵاتی ناوین بووم، بەئاشکرا گووتبوویان کە پشت بەوان بەبەستەم. بەڵام من باوەڕم بەوان نکرد و هیچ کاتێکیش بیرم نەکردۆتەوە باوەڕ بەوان بکەم. دەویسترا لە کەسایەتی مندا ئازادی کوردان بەدیل بگرن. منیشی لەناودا لە بابەتی نابێ هیچ کەس پەی بەشتێکی وانەبات، بیر لەشتێکی وا نەکاتەوە زۆر زەلال بووم. زۆر سەرەنج راکێش؛ گەمەکانی کە لەسەر بەڕێوەبەرانی کۆمار دەکران، لە سەر من و بە رێگای"PKK"ش دەیانویست لە سەرکوردانی بەڕێوەببەن. دیسان ئەوەی لەناو پیلانەکان دابوو، ئەو رەگەزە مۆدێرینیتە سەرمایەداریەی کە بەهەزار و یەك پەتەوە بەیەکەوە گرێدراون.
لەقۆناخی ئیمرالیشدا وەکو ئەوەی لەوشتانەی روویانداوە وانەم وەرگرتووەو ئارام و لەسەرخۆم. لە قۆناخی لێکۆلینەوەو دادگایکردن و دەستگیرکردنمدا ئەو هەڵویستم پاراست. باوەڕدەکەم ئەوانەی لێکۆلینەوەیان لەگەڵ دەکردم، بەتاکتیکی رۆژانە نزیك بوونەوە. هەڵوەستەکردنی بە ئارام و لە سەرخۆی منیان بە هەڵە شرۆڤەکرد. هەمان شرۆڤەی هەڵە لەناوخۆ و دەرەوەی رێکخستنیش دەکران. بەڵام سەرەڕای هەموو شرۆڤە هەڵەکانیش من هەڵوەستەی خۆم هیچ کات خراپ نەکرد. هێشتاش لە"11"مین ساڵوەگەڕی ئەو هەڵوەستەکردنەدا بەتەنهامە. لەبەر ئەوەش لەناو قۆناخێکدا کە لە پاراستنی چوار چین پێك دەێت بەڕێوەم برد.
چینی یەکەم لە بەرگرینامەکانم: لەقۆناخی دادگای کردنمدا هەوڵمدا لەشێوەی پەرتوکێکی بچوك بەناوی" مانیفێستۆی چارەسەری دیموکراتی" بەدەنگ دەربخەم. هەرچەندە بەهێزیش دەنگی نەدابێتەوەش، خاوەنی ناوەڕۆکێکە کە بۆ چارەسەری دیموکراتی هەڵسەنگاندنێکی بە رەگەزی سەرەکی پێشکەش دەکات. هەڵسەنگاندنی لەلایەن حکومەت و لایەنە سیاسیەکان، لەدەستدانێك بوو. قۆناخەکە بەتەواوی بۆ خۆی لێگەڕێندرا، وایان باوەڕدەکرد کە بەو شێوەیە چارەسەر ببێت. هەندێك هەنگاوی چارەسەرئامێزی سەرۆك وەزیری ئەو کات بەرێز بولند ئەجەوید، لەلایەن"MHP"وە کە هاوبەشی حکومەتبوو پووچەڵ کرایەوە. ئەو"AKP"یەی هیچ کات نەی ویستووە لەکێشەکە تێشبگات. ئەبێ کە"نەخشە رێگایەك" کە لە سەرەتاوە هێڵی بەژێردا هێنراوەو پەیوەست لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی باکوری عێراق"باشووری کوردستان"وە، بەشی دەکرد. بۆ بەڕێوەبەرایەتی سەروو، وەکو سەرۆك وەزیر نامەکانی کە نووسیومن بۆ بەرێزان عەبدوڵلا گوڵ و رەجەب تەیب ئەردۆغان لەبەرامبەردا "11" جار رووبەڕووی سزای گۆشەگیری کراوەمەتەوەو ئەو بەرگریانەی کەمنیش کردومن تائێستا وەڵامان وەرنەگرتۆتەوە. هەتاکو ساڵی"2005" کاتەکە بەفیڕۆ چوو. بۆیە قۆناخێك بۆ دەستپێکردنەوەی چالاکیەکان دەستلێبەرنەدراو بوو.
چینی دووەم لە بەرگرینامەکانم: بەرگرینامەکەم لێرەدا بەشێوەی دوو پەرتوکی بەناوی" لەدەوڵەتی راهیبی سومەرەوە بەرەو شارستانیەتی دیموکراتی(بەرەو کۆمار)" بۆ یەکەم دانیشتنی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا پێشکەش کرابوو. ئەزموونێکی چارەسەری دیموکراتی بوو کەهێشتا زیاتر قوولکرابووەوە.
چینی سێیەم لە بەرگرینامەکانم: بە پەرتووکی بەناوی "بەرگریکردن لە گەلێك" بڵاوکراوەتەوە، ئەمەش چووە دانیشتنی دائیرەی گەورەی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا. ئەوەش بەشی سێیەمی پێکدێنا. دروستبوونی کێشەی کورد و هەوڵەکان بۆ چارەسەری لەوێدا گەیشتبووە شێوەیەکی هێشتا یەکلاکەرەوەتر.
چینی چوارەم لە بەرگرینامەکانم: قۆناخێکی کە هێشتا بەناویدا تێپەڕدەبم، وەکو چینی چوارەم و دواین بەش لەبەرگرینامەکانم هەڵدەسەنگێنم. لەژێر ناوی" مانیفستۆی شارستانی دیموکراتی" لەپێنج بەرگدا بەناوەکانی" شارستانیەت، شارستانیەتی سەرمایەداری، سۆسیۆلۆژیای ئازادی، لە رۆژهەڵاتی ناوین شارستانیەتی دیموکراتی، لە تورکیا و کوردستاندا چارەسەری شارستانیەتی دیموکراتی"، بەرگرینامەکەم بەمشێوەیەش کە پێنج بەرگە، چوار بەرگی تەواو بووە. بخوازرێت لە داهاتوودا بەرگی دوای"بەرگی پێنجەم" تەواوبکرێت. ئێستا ئەو هەڵسەنگاندنەی کە بەناوی"نەخشەی رێگا" پێشدەخەم، وەکو شێوەی سەرەتای بەرگی کۆتایە.
ماوەی "25 ساڵان 1984 ـ 2009" کە تیایدا خەباتی چەکداری رۆڵێکی سەرەکی بینیوە، مرۆڤ دەتوانێت وەکو شەڕی حەقیقەتەکان هەڵیسەنگێنێت. لە رزگاربوونی کۆمەڵگا زیاتر، گوزارشت لە دەرخستنە رووی راستیەکاندەکات. ئەو حەقیقەتەی کە لەگشتی جیهاندا دروستبووە. کێشە مێژووی و کۆمەڵایەتیەکان، ئەوەندەی دەربارەی خۆیان حەقیقەتیان دەرخستوونەتە روو دەتوانن بکەونە رێی چارەسەری. وەهایە تاکو سەرکەوتنی چەکداری دروست نەبێت، شەڕی پاراستنی رەوا بەتەواوی دەبنە سەرچاوەی کێشەکان. لەشەڕی"25" ساڵەدا لە سەرکەوتن و بن کەوتن زیاتر، چەندە رۆڵی چارەسەری بینیوە ئەو گرنگە. پێویستە مرۆڤ پرسیاربکات شەڕی"100"ساڵەی نێوان ئینگلتەرا و فەرەنسا، لە سەلماندنی "دەریای مانش" کا دەتوانێت ببێتە سنور بەو لاوە بەکەڵك چیتر هاتووە؟ لە سەلماندنی هەبوونی کوردانداا ئەو

چارەکە سەدەی رابردوو دیاریکەربووە. هەبوونی بە دەوڵەت ـ نەتەوەیێك تاجدارکردن، ئامانجی قۆناخی سەرەتای "PKK"بوو. بەڵام لەکۆتای قۆناخەکەدا ئەوەندەی تێگەیشتین کە ئەو تاجە زۆر پێویست نییە، پێچەوانە ئەوە لەوانەیە ببێتە سەرچاوەی کێشەی نوێ و بۆ ئەمەش بەسەدان ئەزموون بینراوە، پێکهاتەی سیاسی دیموکراتی کۆمەڵگا، هێشتا مانادارترەو چارەسەری دەئافرێنێت.
تێگەیشتن لەقۆناخەکانی پێشکەوتن و گۆڕانی کە"PKK"بەڕێوەیبرد، رێگایەکی هەرە راستە بۆ راست تێگەیشتن لە خودی خۆشی. ژمارەکردنی لە بەرەی سۆسیالیزمی بونیادنراوی لە کەش و هەوای شەڕی ساردی جیهانی ساڵانی"1970"دا، بۆ"PKK"ش بیری لێ دەکرایەوە. بەلای کەمەوە نیاز وابوو. ئەو سەنگەرەی تیا بەجێببوو گوزارشت لەو یەکەی دەکرد. بەڵام ئاستە رۆشنبیریەکەی، ئاستی سۆز و چەمکە شۆڕشگێڕیەکەی زۆر تێنەدەپەڕاند. سروشتی کۆمەڵگای کوردیش لە ئاستێکدا نەبوو بەبێتە کەرستەیەك کە بە چەمك و بیرکردنەوەی مۆدەرێن گوزارەی لێ بکرێت. ئیرادەی شۆڕشگێڕی زیاتر دیاریکەربوو. لە ئایدیۆلۆژیا زیاتر، ژیانی ئازاد دەبووە سەرچاوە. لەبەر ئەو هۆیە کاتێك سۆسیالیزمی بونیادنراو لەبەرچاوان کەوت زۆر کاریگەرنەبوو. لە پارتیەکی چەپگەری مۆدێرێن زیاتر، لە بزووتنەوەیەکی لەسەر بنەمای ئەخلاق و باوەڕی بێ دەچوو. نەوەك تیۆری نەبوو، بەڵام بەهای پەیوەست بوونی سەرەکی ئەخلاق و باوەڕی بوو. دەبێ لەناو کۆمەڵگای کوردیدا کە لەقۆناخی شەڕدا بووە سەرمایەی هەرە گرنگ، هێزی ئەخلاق کە هێشتاش هەبوونی خۆی پاراستووە، مەرجی ژیانی سەختی بوێری و بەرخودانی دەستنیشان دەکرد.
زیاتر پەسند نەکردنی"PKK" وەکو پارتیەکی بە مۆدێلی چەپی مۆدێرێن وەکو نمونەکانی تر، دەبێ هۆکارێکی هەرە سەرەکی بێت کە هێشتا بەرهەمهێنەر و پێشکەوتووە. ئەگەر هەر جیابوونەوەیەکی کە روویدەدا، هەر قوربانیەك کە پێکدەهات نەیتوانی رێگا لە پێشکەوتنەکەی بگرێت، لێرەدا هۆکاری هەرە گرنگ خۆ بەشێوازی پارتی و ژیانی چەپگەریەتی مۆدەرێن لەدەست نەدا. بەتەنها بەشێوەی"PKK" کۆمەڵگای بۆ خۆی وەکو هەبوونێك پەیدا نەکرد، لەگەڵ راستینەی کۆمەڵگا کە بەناکۆکی لەگەڵیدا ژیاندەکا، لەناوخۆشیدا بەوهێزەی لەئازادیدایە، شەڕێکی ناوخۆی بەڕێوەدەبرد. ئەو رەوشەی شەڕی ناوخۆ کە پارتیەکی مۆدەرێن ناتوانێت خۆی لەبەرامبەر بگرێت، لە پێشخستن و هێشتا پتەو بوونیدا بەکاریگەربووە.
گۆڕانی سەرەکی لە"PKK"دا، دوای ئەوەی لە رێگای ناوەندگەرا و ئامانجی دەوڵەت دەرکەوت، کەوتە رێگایەکی بە پێکهاتەی دیموکراتی و سیاسی. گۆڕینی رێگا لەبەر سەختی ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی سۆسیالیزمی بونیادنراو نەبوو. شێوازێکی ژیانی کە لە ژیانی سەرمایەداری کە لە گشتی جیهاندا بەڕێوەدەچوو جیاوازی نەبوو، هۆکاری سەرەکی دابڕاونبوو. یان ئەوەتا لە جیهانێکیتر دەرفەتی ژیانی پەیدا کردبوایە، یان وەکو رووخانی سۆسیالیزمی بونیادنراو بڵاوبووایەتەوە. پشتیوانی هەرە گرنگ لە قۆناخی ئیمرالیدا، ئەو رێگا چارەسەریە دیموکراتیەی کە لەدەرەوە سنووردار لەسەری دەوەستن، بەقووڵی ئاواکردنیبوو. بەرگرینامە و لێدوانەکان، قووڵایی رێگاکە بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش پیشاندەدات. دەوڵەت و "PKK"ش ماوەیەکی زۆر نەیانتوانی پێشکەوتنەکانی لەو لایەنەوە تێبگەن، وەکو گۆڕانێکی تاکتیکی ژماردن، لەلایەن هەندێك کەسەوە، وەکو سەرەتای قۆناخی پاکتاوکرن تێگەیشتن. لە راستیشدا لەتیۆری سیاسی و زانستی سۆسیۆلۆژیادا قووڵبوونەوەیەکی مەزن بەڕێوەدەچوو. "PKK" رووبەڕووی گۆڕانکاریەکی زۆر بەرفروان ببووەوە. کەسە نابەرپرسیارەکان و کەسە ئەخلاق نزمەکان ئەو ماوەیەی گۆڕانکاریان بۆ خۆیان کردە بیانوی هەڵاتن. رەگەزی لەو هەڵاتنانەی لە ساڵانی دوای"2000" دیاریکەر، ئەو لاوازیە ئەخلاقیەبوو لەبەرامبەر جدیەتی گۆڕانکاریدا.
دەوڵەت و دەوروبەرە چەپە پەیوەندیدارەکە، کەوتبوونە ناو هیوایەك کە"PKK" بەخۆ خۆی پاکتاودەکات. ئەو نزیکایەتیە زۆر چەوت و نابەرپرسیارانەبوو. ئەگەر دەوڵەت دواتر بە بەرپرسیاریەتی نزیك ببوایە، دەبوو کە دوای ساڵی"1999" گۆڕانکاری دیموکراتی مێژووی بەڕێوەچووبوونایە. لەبەر ئەوەی بۆ هەوڵە یەکلایەنەکان بەشایستەی وەڵام نەدرایەوە، بەراستیش دەرفەتێکی مێژووی بەبادرا. ئەو چەپەی کە بەبڵاوکردنەوەیەکی بەرفرەوان کەوتۆتە ناو تاکڕەویەتی لیبراڵ، لە دەوڵەت هێشتا بێ بەرپرسیارتر نزیك بۆتەوە. ئەو هەڵاتنانەی روویاندا هیچ بیانوێکی ئەخلاقیان نەدەناسی. راستیەك هەیە کۆمەڵگا ماوەیەکی درێژە لەخشتە نابردرێت، بۆ جارێکیش بەشێوەیێك کە چاوڕێ نەدەکرا، لەناو کۆمەڵگای کوردا پێکهات. ئەو ئێش و ئازارانەی بینرابوون زۆر شتی فێرکردبوون. دڵسۆزیەکی ئاسایش بەشی ئەوەی دەکرد کۆمەڵگا بۆ ئازادی و یەکێتی لەسەر پێی بووەستێنێت. کۆمەڵگایێك ئافرێنراوە ئەگەر"PKK" وەکو رێکخستن لەناویش بچێت، بەردەوام بۆ ئازادی و ئابرۆمەندی خۆی راپەڕێت، گەل و تاکی ئازاد هاتوونەتە ئاواکردن.
وەکو ئەنجام، کێشەی کورد چارەسەر نەکرابوو، بەڵام دەرفەتی چارەسەری تا دوایی زێدە ببوون. وەکو ئەوەی کۆمەڵگا لەسەر پێیان کەوتبووە ناو چاوەڕێی چارەسەری. هەرچەندە"PKK" وەکو دەیەوێت چارەسەری یەکلایەنە بەرەو پێشەوەش نەبات، چانسی چارەسەرکردنی هێشتا بەهێزتر بەردەوام دەکات. ئیتر چارەسەری دەوڵەت ـ نەتەوە لە ناو مەرجەکاندا دەرکەوتووە و رێگا لەبەردەم چارەسەری دیموکراتی سیاسی زۆر دەوڵەمەند کراوەتەوە. دەوڵەتیش ناتوانێت چارەسەریەکانی یەکلایەنە داسەپێنێت. کەوتۆتە جیاوازی ئەوەی کە ئیتر ناتوانێت وەکو رابردوو هەبوونیان بە نکۆڵی کردنێکی توند بەردەوام بکات. ئیتر چارەسەری سەربازی بۆتە شێوازێکی چارەسەری کە ناوەخنەکەی لە رووکارەکەی گرانترە. هێزێکی زۆر و بێ رادە هەندێك جار لەخاوەنەکەی دەداتەوە. هاتبووە حاڵەتێکی وا. ئەو جیابوونەوەو دابڕانەی لەناو"PKK"دا، بەهەمانشێوە لەناو دەوڵەتیشدا بەڕێوەدەچوو. دەوڵەت جاری یەکەمە جەسارەت بکا لەژێر ناوی ئەرگەنەکۆندا خۆی دادگای بکات. کۆماری تورکیا جاری یەکەمە کەوتە قۆناخی لێپرسینەوە لەخۆی بەجدی لە مێژوویدا. زۆر راستی کە نکۆڵیان لێدەکرا، ئتر باسیان دەکرێت.

لەم قۆناخەدا نوێیەدا گرنگترین پێشکەوتن، بێگومان دیداری ساڵی"2007" ئەوەی نێوان سەرۆکی ئەمریکاو سەرۆك وەزیری کۆماری تورکیا ئەنجامدرا و ناوەڕۆکەکەی هێشتا بەتەواوی نازاندرێت. لەو دیدارەدا لەبەرامبەر پاکتاوی خەباتی چەکداری"PKK"، گەیشتنە بڕیاری کۆتای هێنان بەشێوازی کۆنی گلادیۆ. دادگای کردنی ئەرگەنەکۆن گوزارشت لێکردنی بەرچاویەتی. بەواتایەکی تر گەڕابوونەوە ساڵی"1993". بوێریەك دروست بووە کە لەهەڵەکانی "85" ساڵەیان بگەڕێنەوە. سەر لەنوێ لەگەڵ دامەزرێنەرە رەسەنەکانی کۆمار دەگەیشتنەوە یەکتری. دیسان بە مێژوویێکی مەترسیدار تێدەپەڕین. ئەو کوردانەی جیادەکرانەوە، یەکبوون و یەکێتیان دەویست؛ هەمیش لەسەر بنەمای میساقی ـ میللی کە نوژەنکراوەتەوە. مێژوو ناحەقیەکی زۆر گەورە ژیان دەکات، بەڵام هیچ کاتێك لەبیرناکات. رۆژێك دادێت لایەنەکان بۆ تێپەڕاندنی ناحەقی سەرلەنوێ دەگەنە یەك. هیوای چارەسەری کە لەئاسۆ دەبینرێت، هەر رۆژەی کە تێدەپەڕێت هێشتا بەهێزتر دەبێت. کۆمار هێزی ئاواکردنی مۆدێلی دیموکراتی بەخۆی هەیە. ئەگەر خاوەن لەو میراتە دەوڵەمەندەی شارستانیەتی ژیانکراوە وەربگیردرێت و شایستەی رۆحی ئەو یەکێتیەی کە لە ئومەتبوون وەرگیراوە دەربکەون، ئەوا ئەو هێزا بەتەنها بەمۆدێلی خۆی پێشکەشکردن نەوەستێت، بۆ هەموو گەلە بێ چانسەکانی ناوچەکەش نمونەیەك دروست بکات. بەدواداچوون بۆ چارەسەری کێشەی کورد، دەرفەتی مۆدێلێکی دیموکراتی دەستلێبەرنەدراوە.

ج ـ شیمانەکانی چارەسەری بۆ کێشەی کورد

دوای ئەوەی لە سەرەتای سەدەی"19"وەو بەدواوە هەژمونگەرایی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری لە رۆژهەتی ناوین بەجێبووە، کێشەکانی کۆمەڵگا و شیمانەکانی چارەسەریشی گەیاندۆتە قۆناخێکی نوێ. لەلایەن شارستانیەتی هەژمونگەرای رۆژئاواوەو مێژوو گواستراوەتەوە رۆژئاوا. کێشە گشتیەکانی رۆژهەڵاتی ناوین، کە پێیان دەگوترێت کێشەکانی "شەرقی"، لەناوەڕۆکدا دەتوانین وەکو قۆناخی پارچەبوونی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیش پێناسەبکەین، هەر کۆمەڵگا و گەل و نەتەوەێك لەگەڵ تایبەتمەندیە هاوبەشەکانیان، بە تایبەتمەندی جیاوازیش کەوتە رۆژەڤ. لەسەرووی هەموویاندا عەرەب، عەجەم، تورك، کورد، ئەرمەنی، رۆم، سووریانی و یەهودی لەسەر بنەمای میللەتدا، موسڵمان، کریستیانی، موسەویەتی و عەلمانیەت لەسەر بنەمای ئاینی و ئاینزای، وەکوتر لەسەر بنەمای گۆڕەپانە سەرەکیەکانی چینی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی، ئایدیۆلۆژی و سەربازیدا تا دەچوو کێشەو تەگەرە بەشێوەیەکی بەرفرەوان بەڕێوەچوون. لەسەر کێشە کۆنەکان، ناوەڕۆك و شێوەی نوێ زیادکران و ناوچەکە گەیشتە رەوشێك کە بەردەوام قەیران، پێکداپڕان و شەڕ بەڕێوەبچن یان ئەوانەی هێنایە ئەو رەوشە. پێشکەوتووی بنەماکانی شارستانیەتی رۆژئاوا بابەتی گفتوگۆکردن بوو. ئەو پێشکەوتوویش ئەوەندەی کە توند و رەق بوو، لەناو هەموو وڵات، نەتەوەو کۆمەڵگاکانیشدا کێشەو بەدواداچوونی چارەسەریش بەرفرەوان دەبوو، ئەمەش دەستلێبەرنەدراوە.

مێژوو بەردەوام هەر لەخۆیەوە کێشە دروست ناکات، کات و شوێنی کە کێشە بەڕێوەچووینە، لەگەڵ خۆیاندا شیمانەی چارەسەریش بەڕێوەدەبن. ئەوەی گرنگە سەرچاوەی سەرەکی رێگا چارەسەری دروستبوونی کێشەکان و چارەسەریان، پەیوەستە بە مەرجەکانی کات و شوێنەو، بەشێوەیەکی راست پێناسەکردن و پێکهێنانیەتی. بۆ ئەمەش گفتوگۆکردنێکی باش و روونکردنەوەی گرنگێکی ژیانی هەیە. پێچەوانەی ئەمە هەوڵەکان بۆ گفتوگۆ و چارەسەری بەبادەدرێن، ئەوکات بگۆڕێت بۆ شەڕی کوێران. لە راستینەی رۆژهەڵاتی ناویندا، لە دوو سەد ساڵی دوای ئەو هەژمونگەرایەی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری کە بەڕێوەچووە، تا ئاستێك بەڕێوەبردن بەشێوازی کوێران بووە. بەشێوەیەکی گشتی ئەگەر لە سیاسەتی پەرتکە ـ زاڵبەوە بگرین، هەتا دەگاتە تاکتیکی رۆژانەی بۆ ئەوەی لە هەر گۆڕەپانێکدا هەژمونگەرایی پێشبکەوێت، لە ئەنجامی جێبەجێکردنی شێوازی جۆراوجۆر، گرووپێك یان تاکێك نەماوە نەکتبێتە ناو تۆڕەکەوە.

وڵاتی کوردستان و کۆمەڵگای کوردیش لەسەرووی ئەو وڵات و کۆمەڵگایانە دێت کە بەهەژمونگەرایی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری بێ رادە نێگەتیف کاریگەربووە، پارچەکراوەو لەناو کێشە، لەناوبردن و یاخیبووندا هاتۆتە خنکاندن. کورد و باوك و باپیرەکانی کە لە چاخی سەرەتا و ناویندا وەکو وڵات و کۆمەڵگا هەمان کێشەیان هەبوو، لە ئەنجامی فشار و داگیرکەرایەتی لە چاخی مۆدێرینیتەی سەرمایەداریدا، چاخێکە جاری یەکەمە هەبوونیان بە شێوەیەکی جدی و سیستەماتیك کەوتۆتە مەترسی ژیانکردن. ئەو قۆناخەی لەناویدان، قۆناخێکی مەترسیدار بووە کە لەناوبردنی کلتوری و جەستەی زۆرجار پەیڕەوبکرێت. لە ناو ئەو چوارچێوە گشتیەدا، لە گەڵ پێشکەوتنی کێشە کورد و کوردستان، شیمانەی چارەسەریش کە بەردەوام لە گەڵ خۆیدا هێناویەتی، پێشکەوتن و گۆڕانکاریەك ژیاوە.

دەکرێت پێشکەوتن و وەرچەرخانەکان لە سەر سێ شێوەزای سەرەکیدا هەڵسەنگێنین.

1- چارەسەری لەناوبردنی نەتەوەیی هەژمونگەرایی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری

ئەو شێوەیە لە چارەسەری، لەهەموو شێوە چارەسەریەکان توندترە، سیستەمی شارە گەورەکان و داگیرکەرە سەرمایەدارەکانە کە پشت بەتوندو تیژی دەبەستێت. هەرسێ رەگەزە سەرەکیەکەی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری دەوڵەت ـ نەتەوە، سەرمایەداری و قۆرخکاری پیشەسازگەرایی، لەبەر ئەوەی لەژێرخانی هەر کۆمەڵگایێکدا کاتێك نەتەوەی دەکەوێتە ناو، مۆدێلێکی کۆمەڵایەتی یەك رەنگ دروستدەکات، زۆر جار پێویست بە بەسەرکردنەوەی سیاسەتی نکۆڵیکردن و لەناوبردن دەبێتەوە. ئەو سیاسەتە یانیش شێوە ئیدارەکردنە، بەگوێرەی بەرخودانی راستی کۆمەڵگای لە بەرامبەر خۆیدا، دەتوانێت رەگی جیاواز وەربگرێت. ئەگەر دەیەوێت هەبوونی کۆمەڵگای لەبەرامبەر خۆی لەناو ببات و لەناو رەگەزەکانی مۆدێرینیتەی سەرمایەداریدا خۆی بتوێنێتەوە، دەتوانرێت ئاستی توندوتیژی بگاتە لەناوبردنیش. هەندێك جار ئەو کۆمەڵگایەی بەمەبەست وەرگیراوە، لە وڵاتی خۆیاندا بەرەو جوگرافیایەکی هاتۆتە چەمبەرکردن، دووردەخرێنەوە بۆ هەرێمەکانی کە توانەوە بەئاسانی دەتوانرێت پێکبێت. لە گوند و هەرێمە چیایەکان دوورخستنەوە بەرەو شارەکان، شێوازێکی توندوتیژیە. کۆمەڵگا زۆرەملێکان، زیندان، کۆمەڵکوژی جەماوەری، پێکهێنانەکانی

توندوتیژی هێشتا بەفروانترەبوونە. پارچەکردنی وڵاتی دایکیشیان، بۆ ئەوەی بەئاسانتر بەڕێوەبچن، شێوازێکی ترە لە توندوتیژی کە پێکدێت. پراکتیکەکانی توانەوەی بەناچاری مەرجەکانی لەبارکراون، ئەویش دەکەوێتە ئاستی توندوتیژی. ئۆپەراسیۆن، بێکاری و بێتەندروستی کردن، هەموو جۆرە قەدەخەکاریەك، کاروخەباتی لەهەلومەرجی زۆر سەختدا، شێوازەکانی توندوتیژین بەسیستەمن کە بەردەوام لە ئامادەباشیدان. لەگەڵ ئەوانەشدا ئەو کۆمەڵە یان کۆمەڵگایانەش کە بە ئامانجگیراون، ئەگەر هێشتا لەسەرپێ ماوە پێویستە بە رەهای"موتلەق" پاکتاوبکرێن، بەلەناوبردنی جەستەیی لەناوبردنی کلتوری تەواو دەبێت.

لە رۆژهەڵاتی ناوین، کورد و کوردستان هەموو شێوەکانی توندوتیژی کە لەلایەن رەگەزەکانی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری گۆڕاودا، لەلایەن بەڕێوەبەرە قۆرخکارەکانیان و بەتایبەتیش ئەوانەی لەلایەن دەوڵەت ـ نەتەوەوە دەستنیشانکراون، لە هەلومەرجی جیاوازدا بینیویانە. ئەو جێبەجێکرددنانە تەنها بە بەڕێوەبەرەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەی دەسپۆتەکانی تورك، عەجەم و عەرەبەوە پەیوەستکرنی نزیکبوونێکی کەمە. تاکو هەژمونگەرایی ناوەندی سەرمایەداری لە ئامادەباشیدانەبێت، هیچ دەسەڵاتێکی دەسپۆت یان دەوڵەت ـ نەتەوەێك خاوەن ئەو هێزە نییە کە بەتەنها توندوتیژی لەناوبردنی نەتەوەی بەڕێوەببات. تاکو سیستەم رێگا نەدات، بشخوازێت ناتوانێت ئەو هێزە نیشانبدات، ئەگەر پیشانیش بدات ناتوانێت بیکاتە هەمیشەیی. لە سەرەتای سەدەی"19"وە تاکو"1945" ئیمپراتۆریەتی بەریتانی لەهەموو گەشتە لەناوبەرەکانی ئەوانەی سەبارەت بە کورد و کوردستان، لە کۆمەڵکوژی و پارچەبوونەکاندا، لە پراکتیکە تایبەتیە داگیرکەریەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی هەرێمەکە"تورك، ئێران و عەرەب،"دا لایەنگربووە. تاکو بەریتانیا و هێزە هەژمونگەراکانی تر نەبن، قەوارەی دوو سەد ساڵی دوایی کورد و کوردستان نەیان دەتوانی هێڵی بەژێر دابێنن و جێبەجێبیکەن. بەڵام ئەوە بەومانایەش نایەت کە هەموو بەرپرسیاریەتی ئیمپریالیستی شارگەورەکانە؛ ئەو رەگەزانەی مۆدێرینیتەی سەرمایەدارە هەرێمیەکان کە بە سیستەمی ئەوان دروستبوونە، هێشتا زیاتر دڕندەتر و لەناوبەرتربوونە. ئەوەی ئەوانی هێناوەتە ئەو رەوشە، سەرمایەداری دەوڵەتی بەشێوەی کۆنەپەرست، فاشیست، دەوڵەت ـ نەتەوەو پیشەسازگەرادایە. لەبەر ئەوەی لەگەڵ مۆدێرینیستی سەرمایەداری درەنگ یەکتریان ناسیوەو هێزی کلتوریان لاوازە، وادەکا ئەو رەگەزە زیاتر ناچاری دەسەڵاتداریەتی نکۆڵیکار و لەناوبەری نەتەوەی بوونەوە. لەبەر ئەوەی سەرمایەداری کاتێك جێبەجێدەکرێت بە شێوەی قۆرخکاری دەوڵەتەوە بەرەو پێشەوە دەچێت، لەبەر ئەوەی تاڵانچیە، دەست لەسەر دادەنێت، کرێکاریەو مووچەکەشی زیادناکات و داگیرکردن و قازانجی بێسنور بەبنەمادەگرێت، پێویستە بەو شێوەیە بەڕێوەبچێت.

هەمان شێواز بە کەرتی تایبەتیش کە خاوەنداریەتی لێ دەکات پێی جێبەجێدەکات. ئاشکرایە کە شێوەی تایبەت و کەرتی تایبەتی سەرمایەداری تاکو لەناوبردن و توانەوە بە ستەمکاری لە ئامادەباشیدانەبێت، ناتوانێت بەئاسانی جێبەجێبکرێت. خۆی لە خۆیدا دەوڵەت ـ نەتەوە بەخۆی لەئاستی مەزەنترین کارسازی سەرمایەداری دایە. دەوڵەت ـ نەتەوە وەکو شێوەی سەرمایەداری ئەوەی باش بەرێکخستنکراوە بێ هێز پێناسەکردنی، بۆ تێگەیشتن لە قۆناخەکە خاوەن گرنگێکی دیاریکەرە."ئەندازیاریەتی کۆمەڵگای" دەوڵەت ـ نەتەوە، بەناوی ئەتنیکی نەتەوەی هاورەگەز"هۆمۆژەن" وەکو چەرخێکی یەکڕەنگکردن، تاکو ئەو توێژانەی وەکو ئەوەی تری لێهاتووە پاکتاوبکرێت، بەشێوەیەکی بێ بەزەیی بەڕێوەدەبردرێت. هەموو دەوڵەت ـ نەتەوەکانی عەرەب، تورك و عەجەم کەلەسەر کورد و کوردستان دروستکراون، ئەو کارەیان خستۆتە سەرشانی خۆیان.

پێویستە مرۆڤ پیشەسازگەرایش وەکو جێبەجێکردنێکی قۆرخکاری لەناوبەری نەتەوەیی مانای پێبدات. تێکدانی کۆمەڵگای کشتوکاڵی و گوند، بەتەنها جێبەجێکردنی مەزنترین لەناوبردنی کۆمەڵایەتی مۆدێرینیتەیە. پیشەسازگەرایی کە پشت بە وزەی ئاو، خەلوز و ئەو ئەتۆمەی کە رێگای سەرەڕای هەموو دەوڵەمەندیە کشتوکاڵیەکان لە چۆڵکردنی هەزاران ناوچەی دانیشتوان کردۆتەوە، ژینگەی پیس کردوە، ژهراوی کردوە، رووبەڕووی رادیۆئاکتیفی کردۆتەوە، هاوسەنگی سروشتی تێکداوە، سەرچاوەیەکی هەڕەشە ئامێزی هێشتا لە لەناوبردن بەولاترەوەیە. تێکدان و تاڵانکردنی دابوونەریت مێژووی کوردستان، ئازادانە گوزارشت کردنی کوردان لە کلتورەکەیان، قەدەخەکاریەکان لەسەر بەها کلتوریەکان، نەبوونی ئازادی خۆ پەروەردەکردن، لایەنی لەناوبردنی کلتوری بەلای کەمەوە ئەوندەی لەناوبردنی جەستەیی مەترسیدارە دەسنیشاندەکات.

ئەو شێوازە دڕندانەیی کە پێی دەگوترێت چارەسەری سەربازی یانیش بە هێز، پەیوەندیدارە بە داروینیزمی پۆزەتیڤیستەوە. داروینیزمی پۆزەتیڤیست مافی ژیان بۆ خاوەن هێزەکان بەبنەما دەگرێت. کورد لە سەرووی ئەو کۆمەڵگایانەوە دێت کە لە چارەسەری بەفشار و لەناوبردنی لەرێی دەسەڵاتدارانی هێزی سەربازی کە پشت دەبەستنە رەگەزەکانی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری، تا سەر ئێسقان ژیانیکردوە. ئەرمەنی، رۆم، سوریانی، بەدەوی"عەرەبە کۆچەرەکان" و تورکمانیش بوونە قوربانی هەمان شێوەی چارەسەری. ئافراندنی نەتەوەیەکی حاکمی هاوشێویە بەتەواوی ماڵوێرانیە. هەر نەتەوەیەکی یەك رەنگ بەواتای لەناوبردنی هەزاران بەهای کلتوری دێت. ئەو بەرخودان و سەرهلدانانەی لەبەرامبەر مۆدێرینیتەی سەرمایەداری، بەتایبەتیش بۆ پاراستنی هەبوون و کەرامەتی خۆی لە بەرامبەر دەوڵەتگەرای ـ نەتەوەی پیشاندراوە، لەبەر ناهاوسەنگی هێزەوە بەگشتی بەکۆمەڵکوژی ئەنجامگیربووە. هەر کۆمەڵکوژیەك وەکو چارەسەریەکی سەربازی ژمێردراوە. دوای ئەوەی کوردستان لە رێکەوتنی قەسری شیرین "1639" دابەشکرا، ئەو پارچەبوونەی سەرەڕای میساقی میللیش دروستبووە کارەساتەکە هێشتا زیاتری گەورە کردوە، رێگا لەپێش هێشتا بەهێزتر لە جێبەجێکردنی چارەسەری سەربازی کردۆتەوە. نزیکەی"90" ساڵ هەر پارچەیەکی کوردستان لەئاستێکدا کە ببێتە تەختەیەکی ئەزمونی بۆ چارەسەری سەربازی بەجێهێڵدراوە. ئەو تێڕوانینەی"کوردی

درندەو کۆنەپەرست" بەئەنقەست دروستکراوە، کردوویانەتە بیانووی ستەمکاری و هەوڵە لەناوبەرەکانیان.
هێزی کۆمەڵگای سەرەکی کە لەپشت چارەسەری هێزی سەربازیە، بوورژوازی چینی ناوین و ئەو بیرۆکراسیەیە کە لەلایەن رەگەزەکانی مۆدێرینیتەوە ئاواکراون. ئەو چینە چاوەکانی لەسەر بنەمای نکۆڵیکردن لەکورد کردۆتەوە. رێگای گەورەبوونیشیان، بەپێکهێنانی داگیرکردنی کوردان و رژاندنی خوێنیان بێ بەرامبەر. کورد و کوردستان وەکو سەرچاوەی کەرستەی خاوی سروشتی ئەو چینەیە. بۆ ئەوان هیچ کاتێك نرخێکی ئۆبژەبوون نەهاتۆتە داین؛ بەردەوام لە ئاستی نەسلەبوون وەکو ئامێرێك و لە قەوارەی ئەو کۆیلایەتیەی کە لەسەر ژن بەرێوەدەچێت هێشتا خراپتر. لەبەرامبەر دەرکەوتنیان هێزە هەژمونگەراکانی رۆژئاوا کەمێکیتر سیاسەتێکی داگیرکەری سست بەرێوەدەبن، نەلەبەر پێخۆشبوونیتیان بۆ سەربەخۆی و ئازادیە، بەڵکو بۆ ئەوەی بتوانن کەرستە خاوەکە لەدەست ئەوان بگرن و لەهەلومەرجی هێشتا گونجاوتردا بەرێوەی ببەن، لەبەر ئەوەش لەبەر هۆکاری مەترسی ئەوەی دەڵێن لەبەرامبەری ئەوانەی تری بەکاربێنەوە.
لەسەر کورد و کوردستان لە ساڵی"1920" بەدەواوە، لە ژێر سێبەری هەژمونگەرایی رۆژئاوادا، لە بەرامبەر ئەو دەستبەرداریەی کە بۆ ئەو هێزانەیان نیشاندا، بەشێوەیەکی نادیار و داخراو رێکەوتنێکی چوار قوڵی جێگای باسە. هەژمونگەرایی رۆژئاوا بۆ ئەوەی هەر چوار دەوڵەت ـ نەتەوەی ناوچەکە"ئێران، تورکیا، سوریا، عێراق" وەکو دەیانەوێت ئاراستەیان بکەن، لەژێر دەستیدا یاری کردن بە کورد و کوردستان، بۆ خۆیان وەکو مەعریفەتێك ژمارد. وەکو ئەوان پشتیوانی دەکەن وا خۆیان نیشاندەدەن، دوای ئەوەی گەیشتنە مەبەستەکانیان ئەوانیان وەها بەجێهێشت، بەگوێرەی بەرژەوەندیەکانیان هێشتا گونجاوتریان بینیوە. لەسەر هیچ گەلێکی جیهان و لەسەر هیچ وڵاتێکی جیهان ئەوەندە هێزی سەربازی بەکارنەهاتووە و پلان و گەلەکۆمە بەکارنەهاتوون. ئەرمەنی، رۆم و سوریانیش ببوونە قوربانی جێبەجێکردنی مۆدێرینیتەی بەو شێوەیە. رووخاندنی دەوڵەت ـ نەتەوەی عێراق لە ساڵی"2003"دا، بەرێوەبەرانی سوریە، ئێران و تورکیای خستە ناو مەترسی، هەموو ئەو ناکۆکی و گیروگرفتانەی لەناو خۆیان هەیە خستەلاێك، ئەو برایەتیە ئاینیەی کە زۆریان باس دەکرد وازیان لەویش هێناوە، لەبەرامبەر کوردان رێکەوتنە پیرۆزەکانیان بەرەو نوێبوونەوە بردن. ئەو هێزانە رێکەوتنی کە نەیانتوانیوە لەبەرامبەر هیچ دوژمنێکیان پێشبخەن، لە بەرامبەری کورد و کوردستان بەبێ مەترسی، بەخێرای جێبەجێیان کردوە.
کورد سەرەرای ئەوەی بێ پارێزەر و رێکەوتنیش بوون لەبەرامبەر هەژمونگەرای چینی و رێکەوتنەکانیان راپەرِیوە، وەکو ئەوانەی سەردەمی خۆیان نەیان توانیوە نەچارەسەری دەوڵەتگەرای ـ نەتەوەی و نەچارەسەری نەتەوەی دیموکراتی پێشبخەن. هەرچەندە رووخاندنی دەوڵەت ـ نەتەوەی عێراق بۆ هەندێك لە هێزی کوردان لە چوارچێوەی دەوڵەت ـ نەتەوەدا رێگای لەبەردەم پێکهێنانی دەوڵەتێکی فیدرالیش کردبێتەوە، زێدە لە ئاستێکی ئاسایشیدا نییە. ئەو پێکهاتە بۆ کوردان نایێتە واتای رزگاری، دەخوازرێت کە ئەمە وەکو ئامێرێکی کۆنترۆڵی هێزە هەژمونگەراو داگیرکەر بەکار بهێندرێت. لەگەڵ ئەوەی چارەسەری سەربازی و سیاسەتی هێز لەسەر هەر پارچەیەکی کوردستان و خەڵکەکەی، بانگەوازیان بۆ گەیشتنە ئامانجە باوەکان وازیشیان لێ نەهێنابێت، ئیتر خاوەن ئەو هێزەی رابردووش نیین. لەبەر ئەوەی زۆر ئاشکرابووە، بنەماکانی نۆکەرایەتیش بەخێرای لەدەستدەدات. لەگەڵ ئەوەی چارەسەری هێزی سەربازی دەوڵەتگەرای ـ نەتەوەی بەشی هەرە زۆری کۆمەڵگاش پشتی پێدەبەستێت، دەمامکی بەکرێگیراوە کوردە باوەکان لەبەر تێکۆشانی"30" ساڵی رابردوو باشتر لادراوە، ئەوانیش ئاشکراو ریسوابوونە. لە لەدەستدانی هێزی چارەسەری سەربازیدا، رۆڵێکی گەورەی هەیە لەهەڵوەشانەوەی بنەمای توێژی بەکرێگیراواندا بەرێوەدەچێ.
لەگەڵ بەجێبوونی هەژمونگەرایی ئەمریکا لە عێراق، زەمینەی بەردەوامکردن بە شێوازە کۆنەکانی جموجۆڵەکانی گلادیۆی ناتۆ لەسەر کورد و کوردستان، یانیش شێوازەکانی کۆنترا گەریلا زۆر خراپ بووە. لەبەر هەڵوێستی لەبەرامبەر"PKK" و دەوڵەتی فیدراڵی کورد، ئەو ئالۆزیەی نێوان کۆماری تورکیا و ئەمریکا بە رێکەوتنی واشنتۆن لە ساڵی"2007" وەرچەرخا بۆ قۆناخێکی نوێ. تێدەگەین کە لە بەرامبەر وازهێنان لە خەباتی چەکداری"PKK"دا، لەژێرخانی دەوڵەت ـ نەتەوەدا رۆڵێکی سەرەکی نادات چارەسەری سەربازی، لەسەر نزیکبوونەکان لەئاستی کۆمەڵایەتی، سیاسی و کلتوریش چارەسەری پێشنیاردەکات، گەیشتوونەتە رێکەوتنێکی گشتی. دادگایکردنی ئەرگەنەکۆن بەم رێکەوتنەوە پەیوەستە. پەیوەندی دروستکردن لەگەڵ دەوڵەتی فیدراڵی کورد ئاسایەو پێویستە مرۆڤ بەشی ئەو رێکەوتنە ببینێت. بەمشێوەیە هەڵسوکەوتەکانیان لەسەر کورد و کوردستانی بەرێوەبەرایەتی دەوڵەتگەرای ـ نەتەوەی تورك ناچاربوو گۆرانکاری بێنێتە ئاراوە. هەردوو لقەکەی تری مۆدێرینیتەش، رێژەی سوودمەندبوونی سەرمایە تەنگاو بووەو بەرژەوەندیەکانی پیشەسازگەرایەش لەسەر عێراقیش، لێرەدا زۆر بەکاریگەر بووە. سیاسەتی نوێی کورد و کوردستانی کۆماری تورکیا، بە گرانی لە چارەسەری سەربازیەوە دەرکەوتووە، بەرەو سیاسەتەکانی لە گۆرِەپانەکانی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی و کلتوری وە چووەو کراوەشە بۆ رێکەوتن. هەڵبەتا ئەمەش پێشکەوتنێکی گرنگە، پێشکەوتنێکە کە کاریگەری لەسەر هەموو کورد و کوردستانە، لە بەر ئەوەش کاریگەری لەسەر هەموو رۆژهەڵاتی ناوین هەیە، ئەمەش لەگەڵ خۆیدا ئەنجامی گرنگ بەئافرێنێت.

2 ـ چارەسەری دەوڵەتگەرای ـ نەتەوەی فیدراڵیەتی کورد

ئەو چارەسەریە پشتدەبەستێت بە باشووری کوردستان و کوردانی ئەوێ، لە راستیدا رەنگدانەوەی شێوازی چارەسەری هێزی هەژمونگەرای رۆژئاوایە. ئەو هێزانە لەبەر ئەوەی باوەریان بەچارەسەریەکانی دەوڵەتگەرای ـ نەتەوەی ناوچەکە ماوەیەکی زۆرە نەماوە و لەبەر ئەوەی ئەو شێوە چارەسەریە بۆ جێگیربوونیان لەناوچەکەدا گونجاو نییە، چارەسەری دەوڵەتگەرای ـ نەتەوەی فیدراڵ ناچار دەکات. بەو شێوەیە چ لە بەجێبوونی وڵاتە پەیوەندیدارەکان و چ لە

دەوڵەت ـ نەتەوەی ناوچەکە و رەگەزەکانی تری مۆدێرینیتەیان بەخۆیانەوە پابەندو پێشخستوە، ئەو چارەسەرییەی کەپشتدەبەستێت بەکوردەکانی باشوور، ئەوا ببێتە خاوەن رۆڵێکی مەعنەوی کە باوەڕی دەدات. دەوڵەت ـ نەتەوەیەکیش بەتەواوی سەربەخۆش باشترنابیندرێت و لەولایەنەوە گونجاو نییە، لەبەر ئەوەی ناتوانێت هەمان رۆڵی مەعنەوی ببینێت. رەگەزەکانی مۆدێرەینیتەی سەرمایەداری کوردیش، لەبەر ئەوەی ئیتر سیاسەتە بەکرێگیراوە باوەکانیان ریسوابووە، هەروەها ئیتر ناتوانێت بەرژەوەندیەکانیان پێکبێنن، ئەوانیش وەرچەرخانێکی بەرەو چارەسەری فیدراڵیان پێکهێناوە. پێویستە مرۆڤ ئەو دەوڵەتە فیدراڵیە کوردیەی لەباکوری عێراق"باشووری کوردستان" تەنها وەکو وەرچەرخانی بوورژوازیانەی ئەو هەرێمەی نەبینێت، بەڵکو پێویستە وەکو وەرچەرخانێکی بوورژوازیانەی چینی بەکرێگیراوی هەموو کوردستان هەڵسەنگێندرێت. رەگ و ریشەیەکی کۆنی هەیە. لە هەموو راپەڕینەکان و رێکخستنە مللیگەراکاندا، چارەسەریەکانی لەو لایانانەدا، بەردەوام وەکو ئامانج دەستنیشانکراوە. سەرەڕای پارچەبوون و بڵاوبوونی زۆری نێوانیشیان، مرۆڤ دەتوانێت ئاستی نوێی ئەو هێزانە وەکو مۆدێرینیتە سەرمایەداری کورد هەڵسەنگێنێت.

بەتایبەتی بەرخودانی"30" ساڵی دوایی"PKK"، ئەوانیشی ناچار کردوە لەناو خۆیاندا بکەونە ناو راوێژکردن و بەدواداچوونی چارەسەری فیدراڵی. هەرچەندە بڵاو و زۆر سەر و لایەنیش بن، لەئاستی سیاسی ـ ئایدیۆلۆژیدا لاوازیشیان هەبێت، ئەوا پێداگری بکەن لە شێوەی چارەسەری لە چوارچێوەی دەوڵەتۆچکە ـ نەتەوەی کوردی فیدراڵیدا. هەرچەند دەوڵەت ـ نەتەوەکانی ناوچەکە"تورکیا، ئێران، سوریا، هەتا دەوڵەتی ناوەندی عێراقیش" لەبەرامبەریشی بووەستن، شیمانەی مەزن بەپشتگیری هەژمونگەرایی سەرمایەداری هەبوونەکەی بکرێتە هەمیشەیی. هەژمونگەرایی جیهانی ئەوا ئەو مۆدێلە وەکو مۆدێلێك پێویستە لەهەموو رۆژهەڵاتی ناوین پێکبێت، بەگوێرەی بەرژەوەندیەکانیان هێشتا گونجاوتری ببینن. چارەنوسی چارەسەری فیدراڵی، پەیوەستە بە راست تێگەیشتن لە ناسنامەی کورد و رێزلێنانی ئەم ناسنامەیە لەلایەن بورژوازی و دەوڵەت ـ نەتەوە سەردەستەکان. ئەزموونی عێراق ئەوە نیشاندەدات کە هێشتا نەهاتوونەتە ئەو قۆناخە. نزیکبوونی دەوڵەت ـ نەتەوەی عەرەبی سوریا، کوردان لەدەروەی کۆمەڵگای دەوڵەتدا دەژمێرن. نزیکی ئەوەش نابن کەوا کوردان وەکو هاوڵاتی پەسند بکەن. مللیگەرای شیعەی توند لەئێران، لەبەرامبەر دیاریدەی کورد بیانیەو بۆ توانەوەی کوردانیش دەستنادات. بەڕێوەبەرایەتی هەرێمی باوەیش پشت بەستن بە رەگەزی ئەو شێوە مۆدێلەش کاتی دەوێت. ئەو بەڕێوەبەرایەتیەی هەیە دووری فیدرالیزمە. رزگاربوون لە هزری نکۆڵیکار و توانەوەی"ئاسیمیلاسیۆنیست" بوورژوازی چینی ناوین و بیرۆکراسیەتی تورك دەکرێت هێشتا زووتر ئەنجامگیربێت. لەبەر ئەوەی جەماوەری زۆری کورد لە کۆماردا و لە پێکهاتەی رابردوویدا، لەگەڵ توێژی سەرەوەی تورك یارمەتیدانی بەهێزە، لەوانەیە ئەو راستیە رێگا لەبەردەم شۆڕشێکی هزری بکاتەوە.

لەوانەیە بیرهاتنەوەی هاوکارە ستراتیژیەکانی لە قۆناخی دامەزراندنی کۆماردا زەحمەت نەبێت. تا ئەوکاتەی راست لە مێژووی هاوبەش تێبگەن، پەسندکردنی کوردیش لە پێکهاتەی دەوڵەتدا بەرەو پێشەوە بچێت. تورك وەکو میللەت زۆریان تاقیکردۆتەوە کە بێ کورد لە قۆناخە مەترسیدارەکاندا ئەوا ببێتە ماڵوێرانیەکی ستراتیژیك. لە قۆناخی ئاسایدا ئەگەر فیدراڵیش نەبێت، ئەگەر پەسند بکرێت ئەزمونی ژیانی هاوبەش سەخت نییە. ئەو لەناو یەکتربوونە کۆمەڵایەتیەی کە بەروپێشەوە چووە، دەتوانرێت لەلایەنی ژیانی هاوبەشدا هەڵسەنگێندرێت. ئەگەر ریسواکاری ئایدیۆلۆژیا نەتەوەپەرست و مللیگەرا و بنەما ریشەیە مێژووی و قوڵەکانی چەمکی ئومەت ـ میللەت لەلایەنی دیموکراتی موحفەزەکاردا بەکاربهێندرێت، ئەوا بەکرێگیراوە کوردە کلاسیکەکانیش ئەو ریزانە هەڵبژێرن. ئەو راستیەی بەڕێوەش دەچێت لەو لایەنەوەدایە. هەرچەندە چارەسەری سەربازی بەردەوام لەبەر دەرگاش بێت، گفتوگۆکردنی فیدراڵیزم بەلای کەمەوە لە ئاستی ئازادی بیرکردنەوەدا گفتوگۆکردنی دەبێت.

توانستی کۆمەڵگای چ بۆ چارەسەری هێزی سەربازی و چ بۆ فیدرالیزمی بکرێگیراودا تەنگە. چارەسەریەك نییە بەگوێرەی بەرژەوەندی کوردان و هەروەها کۆمەڵگای دراوسێکانیشی. ئەو مۆدێلە چارەسەری سازشکاری لەنێوان نوخبەی سەروو و رەگەزەکانی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری نیشاندەدات. ئەوەندەی لە توێژی خوارەوەی کۆمەڵگا بترسێن، هێشتا زیاتر نزیکی پێویستی چارەسەری دەبنەوە. ئەو چارەسەریەی کە لەهەموو بزووتنەوە رزگاریخوازە نەتەوەیەکان و سەندیکاکانی چینی کرێکار بەڕێوەدەچێت، چارەسەری چینی ناوینە. چارەسەرنەکردنی ئەو کێشانەی لەئارادان، پەیوەستە بەو پێکهاتە چینایەتیەوە. توانای چارەسەری هەر چینێك هەیە لە چارەسەر ریشەی کێشەکانی کۆمەڵگادا، پێویستە رەگەزەکانی کۆمەڵگای دیموکراتی ئەوانەی لە دەرەوەی رەگەزەکانی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری بکەونە جوڵەو رۆڵی مێژوویانەی خۆیان ببینن. مێژووش بۆ مۆدێرینیتەی سەرمایەداری کوردی ئەو توانایەی کە بەش دەکات پیشان نادات. بەدواداچوونی چارەسەری دەوڵەت ـ نەتەوە، خاوەنی ئەو توانایە نییە بتوانێت فیدرالیزم تێپەڕێنێت. فیدرالیزمیش بەتەنها بۆ چارەسەری کێشەکانی کۆمەڵگای کورد کەبەردەوام لەناو قەیراندایە بەش ناکات؛ بەتەنها دەتوانێت لە چارەسەری نەتەوەی دیموکراتیدا رۆڵێکی باش ببینێت و بەوشێوەیە دەتوانێت ئەو مەترسیانەی کە لە کەموکوڕیەکانیەوە دەردەکەوێت تێیانپەڕێنێت.

3 ـ چارەسەری نەتەوەیی دیموکراتی

تایبەتمەندە دیارەکانی چارەسەری نەتەوەیی دیموکراتی، لە دەرەوەی دەوڵەت لە چارەسەری دەگرێت. گەڕان لە دەرەوەی دەوڵەت بە واتای رووخانی دەوڵەت و لە شوێنی دەوڵەتێکی تر ئاواکردن نییە، نە وەکو درێژکراوەی دەوڵەتی ئاسایش لەناویدا بتوێتەوە. کۆمەڵگا لە چارەسەری دەگەڕێت لە ناوخۆیدا و بەئیرادەی دیموکراتیانەی خۆی. دەوڵەت بەباش و بە خراپ ناکاتە ئامانجی. بەشێوەیەکی وەها چ لە مێژووی هەموو شارستانیەتدا و چ لە قۆناخی مۆدێرینیتەی

سەرمایەداریدا، چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵگا و چارەسەری بەرژەوەندیەکانی چینی لەلایەن توێژی سەروو، پەیوەستی دەوڵەتبوونە. شیامەنەیەکی چارەسەری بەشێوەی "دەمۆس" نابێت. چارەسەری دەوڵەتی پرۆلیتاری و گەل کە بەناوی رەنجدەران و گەلان سۆسیالیزمی بونیادنراو پێشنیاری دەکات، لەخشتە بردنە و هاتوونەتە هەڵخەڵەتاندن. ژیان ئەو راستیەی پشتراستکردۆتەوە. ئەو شەڕانەی لەپێناو دەسەڵاتداریەتی و دەوڵەتبووندا بەڕێوەچوونە، بەردەوام بۆ بەرژەوەندی توێژی سەردەست و سەرمایە بووە. لەمێژوودا تاکو رۆژی ئەمڕۆ زێدە پێشنەخستنی چارەسەری دیموکراتی، لەبەر پێویستی بەرژەوەندیەکانی نوخبەی قۆرخکاری دەسەڵاتدار و قۆرخکارانی سەرمایەیە. لەچارەسەرکردنی کێشەکانی ئەمڕۆکەشدا، هەمان راستی جێگای گفتوگۆیە.

ئەو "PKK"یەی لەژێر کاریگەری سۆسیالیزمی بونیادنراو دابوو ماوەیەکی درێژ نەیتوانی پارادیگمای دەوڵەتگەرای ـ نەتەوە تێپەڕێنێت، ئەوەش هۆکاری بنەڕەتی چەقبەستبوونەکەی بوو. ئەو رەوشە لەچەقبەستبوونی کۆماری تورکیا دەچێت لەلایەن رەگەزەکانی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری. ئەوەی بەئامانج گیرابوو، تورکیا وەرچەرخێنە دەوڵەتێکی سۆسیالیست، لە کوردستان دەوڵەتێکی سۆسیالیستی دروستبکەن و دواتریش لەنێوان هەردووکیاندا یەکێتیەکی ئەنتەرناسیۆنالیست بئافرێنن. لەم پارادیگمایەدا جێگایەکی ئەو تۆ بۆ دیموکراتیەت و کۆمەڵگای دیموکراتی نەبوو. ناکۆکیە چینایەتیەکان لە سروشتی دەسەڵاتداریەتی و دەوڵەتدا نەدەبینران. وەکو کە مارکس وەهای باوەڕدەکرد کە کۆمەڵگایەکی ساف سەرمایەدار دەتوانرێت دروست بکرێت، وەهاش باوەڕدەکرا کە دەتوانن بەتەنها دەوڵەتێکی چینایەتی دروست بکرێت. لە راستیدا وەکو راستیەك لەوانەنییە نە دەوڵەت بەتەنها چینایەتی دەبێت نەبەتەنهاش سەرمایەداری. لەو لایەنەوە هەندێك رەخنەی ئەنارشیستەکان مافدار و راستیش بێت، بەڵام ئەوانیش لە بابەتی ئامانجی کۆمەڵگای نەتەوەیی دیموکراتی نەیان دەتوانی بەرەو پێشەوەی ببەن.

تێگەیشتنی"PKK" لە کۆمەڵگای نەتەوەیی دیموکراتی قۆناخێکی بەئێش و ئازاربوو. هەمانکاتیش سەر لەنوێ لەدایکبوونەوەیە. رتکردنەوەی بوونە بە پارتیەکی سۆسیالیستی بونیادنراوی کلاسیکە. وازهێنانە لە ئامانجی دەوڵەتبوون. لەسەرووی ئەو پارتیانەوە دێت کە لەولایەنەوە وەرچەرخانیان ئەنجامداوە.

چارەسەری نەتەوەی دیموکراتی، بەتەنها پێشنیارێکی شیمانە بۆ کراوی پەیوەست بە چارەسەری تایبەت بە گەلی کورد و کوردستانەوە نییە. لە سەروویاندا کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوین، پێشنیارکردنی چارەسەریەکی گەردوونییە بۆ هەموو کۆمەڵگاکان. چەتری سیاسی چارەسەری نەتەوەی دیموکراتی، کۆنفیدرالیزمی دیموکراتیو کۆمەڵگای مەدەنییە ئەوەی کە دەوڵەت نییە. هیچ لێکچوونێکی کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی لەگەڵ فیدرالیزم و کۆنفیدرالیزمی دەوڵەتیەوە نییە. ئەوانە دیاریدەی جیاوازن.

مۆدیلی ئابووری ـ کۆمەڵایەتی چارەسەری نەتەوەیی دیموکراتی، تیمە کۆمیناڵەکانن. تیمەکانی کۆمەڵگای ژینگەپارێزی، کۆمەڵایەتی و ئابووری، بۆ مەبەست قازانجکردن بەڕێوەناچن. دانانی پێویستیە بنەڕەتیەکان لەپێشە. ئەگەر بازاڕیش هەبێ قۆرخکاری سنورداردەکرێت، لەژێر کۆنترۆڵی ئەخلاقی کۆمەڵگادا دەبێت. بەهای ئەخلاقی و سیاسی لەناو کۆمەڵگادا، لە پێش حقوقەوەیە. لە کۆمەڵگای حقوقی زیاتر، بنەماکانی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی لە پێشترە. لە پێکهێنانی کاری کۆمەڵایەتی و کێشەکاندا پێوانە دیموکراتیەکان راستەوخۆ دەربازدەبن. دیموکراتیەت راستەوخۆ بەهۆشیاری زانستی سەردەمیانەوە پەیوەستە. ئازادی کۆمەڵگا و تاك بە ژیانکردنی لەناو یەکتریدا بەهۆشیاری زانستی، ئەخلاقی و سیاسیەوە پێکدێت. پێوانی تاکی ئازاد، پەیوەستە بە ئازادی تیمە کۆمیناڵەکانی کەشوێنی تیادەگرێت. دابران لە کۆمەڵگا بەواتای ئازادی نایەت.

لەگەڵ ئەو تایبەتمەندیە گشتیانە، دەتوانین سەرلەنوێ هەندێك پێوانەی تری چارەسەری نەتەوەی دیموکراتی ریزبکەین.

أ ـ نەتەوەی دیموکراتی: رەوشی نەتەوە لە کۆمەڵگای دیموکراتی کەپشت نابەستێت بە زمان، ئەتنیك، چین و دەوڵەت، پەشتەبەستێت بە پڕ زمانی، پڕ ئەتنیکی، رێگا بە جیاوازی چینایەتی و دەوڵەتەوە نادات، پشتەبەستێتە تاکی ئازاد و یەکسان و گوزارەی لێ دەکات. نەتەوەی دیموکراتی لە هاوڵاتیانی دیموکرات و کۆمەڵگای دیموکرات پێکدێت. پارادیگمای نەتەوەی میانڕەو کەلە ناسنامە کلتوریە کراوەکانن بە بنەمایان دەگرێت.

ب ـ وڵاتی هاوبەش" وڵاتی دیموکراتی": گوزارشت لە کۆبوونەوەی وڵاتی دایك کە هیچ کەس ئەوەی تر، هیچ کۆمەڵگایەك کۆمەڵگاکەی تر ناکەتە وەك خۆی، بەشێوەیەکی ئازاد و یەکسان دابەشدەکرێت دەکا.

ج ـ کۆماری دیموکراتی: گوزارشت لە کراوەبوونی دەوڵەت لە کۆمەڵگا و تاکە دیموکراتەکانی دەکا. رێکخستنبوونی دەوڵەت و رێکخستنبوونی دیموکراتی تاکەکان راستی جیاوازن، رێزگرتن لە رەوابوونی یەکتری بەبنەما وەردەگرن.

چ ـ دەستوری دیموکراتی: دەستور کەبە رێکەوتنێکی کۆمەڵایەتیەوە دروستکراوە، هاوڵاتی و کۆمەڵە دیموکراتیەکان لە بەرامبەر دەوڵەت ـ نەتەوە دەپارێزێت.

د ـ لەیەك جیا نەبوونەوەی مافی تاك و هاوبەش"کۆلەکتیف": وەك چۆن ئەو کۆمەڵگایەی لە تاکەکان دروستبووە دیسانیش لە کۆبوونەوەی تاکەکان شتێکی جیاوازتربێت، ئەگەر لەنێوان ئەواندا جیاوازیەکیش هەبێت، مافەکانی تاك و کۆلەکتیفیش گوزارە لە دوو رووی هەمان کۆمەڵگا دەکات. وەك چۆن یەك رووی مەدالیایێك نابێت، کۆمەڵگایەك یان تاکێکیش بەتەنها نابێتە خاوەن مافی تاك یان کۆلەکتیف.

ف ـ سەربەخۆی ئایدیۆلۆژی و ئازادی: چارەسەری نەتەوەی دیموکراتی، تاکو هەژمونگەرایی ئایدیۆلۆژی پۆزەتیڤیستی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری و کۆیلایەتی لیبراڵی وەکو ئەو تاکڕەویەتیەی لەنوێ وە دروستکراوەتەوە تێنەپەڕێندرێت، جێبەجێ ناکرێت. زانابوونی بنەڕەتی سەبارەت بەسروشتی کۆمەڵگاکەی، مەرجی زانابوونی چارەسەری نەتەوەی دیموکراتیە.

گ ـ مێژوویبوون و ئێستای بوون: راستیە کۆمەڵایەتیەکان، راستی مێژووین. ئەو راستیانەی کە لەمێژوودا بەرێوەچوون بەجیاوازیەکی زۆرکەم، ئێستا رۆژانە بەرێوەدەچێتەوە. تاکو پەیوەندی نێوان مێژوو و ئێستا راست دروستنەکرێت، هزری کۆمەڵایەتی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری بێ مێژووی کردنی تاکرەویەتیەی و یەك شێوەی، لەناکاوی و بەتەنها هەنووکەیبوون تێناپەرێندرێت. راست تێگەیشتن لە مێژوو و ئێستا، بۆ چارەسەری نەتەوەی دیموکراتی مەرجێکی پێویستە.

ە ـ ئەخلاق و ویژدان: هیچ کێشەیەکی کۆمەڵایەتی تاکو ئەخلاق و ویژدان بەسەرنەکاتەوە، ناگاتە چارەسەریەکی بەتەندروست. چارەسەریەکانی مۆدێرینیتەی بەتەنها هێز و حقوقە، لە چەوساندنەوەو ناوەرۆك دوورخستنەوەی کێشەکان بەولاتر هیچ ئامانجێکیترنادات. لە چارەسەری نەتەوەی دیموکراتیدا، مەرجە ئەو رەوشەی کە سەرچاوەی خۆی لە ئەخلاق و ویژدان وەردەگرێت.

و ـ پاراستنی بنەرەتی دیموکراتیانە: وەکو ئەوەی هیچ زیندەوەرێك بێ پاراستنی بنەرەتی نەبێت، کۆمەڵگای دیموکراتیش ئەوانەی لەهەموو هەبوونەکانی سروشت پێشکەوتووتریشن بەبێ پاراستنی بنەرەتی نابن، ناتوانێت هەبوونی خۆی بەردەوام بکات. لە چارەسەریەکانی نەتەوەی دیموکراتیدا پێویستە پرەنسیبەکانی پاراستنی بنەرەتی پەسندبکرێت.

ئەو نزیکایەتیە بەپرەنسیبانەی کە پێویستە هێشتا زیاتر پێشبخرێن، وادەکات چارەسەری نەتەوەی دیموکراتی لەنزیکەوە بناسین. ئەو پرنسیبانەی"یەکێتی ئەوروپا" وەکو وەرچەرخانێك بەردەوام دەربازی رۆژهەڤی خۆمانی دەکەین، بەگشتی بۆ کێشەکانی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوین، هێشتاش زیاتر بۆ کێشەکانی کۆمەڵگای کورد، بەراستی وەکو دەرمانە. لەسەر بنەمای ئەو پرنسیبانەو لەچوارچێوەی پێناسەکردنی ژیانی نەتەوەی دیموکراتی، ئەگەر چارەسەری دیموکراتی لە کوردستان پێشبکەوێت، خاوەن رۆڵێکی دیموکراتیە.

کەوتنە قۆناخی دیموکراتیبوونی تورکیا و چارەسەری دیموکراتیانەی کێشەی کورد، وەکو دوو رووی مەدالیایەکە. رووێك بەبێ رووەکەی تر نابێت. ئەگەر ئاستی چارەسەری لە تورکیا هەندێکی تر یەکلای بکەینەوە، ئەوا هێشتا زیاتر روون ببێتەوە. پێش هەموو شتێك ئەو نزیکایەتیە بەپرەنسیبەی کە لە ژووردا بەکورتی لەسەری وەستاوین و دووبارەکراوەتەوە، ناتواندرێت نەبیندرێت. ئەو چارەسەریانەی کە پرەنسیب و سیستەمیان نییە، هەم لێیان تێناگەین هەمانکاتیش وەکو تیمارکردنی برینێکی رۆژانە بەولاتر هیچ ئەنجامێکیتر نادات. ئەو چارەسەریەی کە بیری لێ دەکرێتەوە، ئەگەر سیستەمی هەژمونگەرایی سەرمایەداری هەڵوەشێتەوە، ئەگەر بەردەوام بکات، شیمانەیەکی چارەسەریە کە لەناو هەموو قۆناخەی پێکهاتەکاندا جێبەجێکردن و بەرێوەچوونی دەپارێزرێت.

تایبەتمەندی یەکەم، بەو واتایە دێت کە لە قۆناخی شارستانیەتی رۆژئاوادا تاکو بۆ تێپەراندنیشی چارەسەریەکی کراوە پێشنیار دەکرێت.

تایبەتمەندی دووەم، پێکهات، دەزگابوون و قۆرخکاری ئایدیۆلۆژی ئەو لایەنانەی کە لەپشتیاندا رەگەزەکانی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری کە لەناو کۆماری تورکیادا هەرچی دەبن کێش نییە، هەبوونی کۆمەڵگای نەتەوەی دیموکراتی، لەبەر ئەوەش هەبوونی چانسی چارەسەری و رەوابوونەکە پەسند دەکات. ئەوەی لێرەدا بیری لێ دەکرێتەوە، بەشۆرش پاکتاوکردنی رەگەزەکانی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری" دەوڵەتگەرای ـ نەتەوەی، سەرمایەداری و پیشەسازگەرایی" پێشنیار دەکات، نە لەرێگای لەناوبردن و ئەو توانەوەی کە لەلایەن سیاسەتەکانی هێزە سەربازیەکانەوە پەسند دەکرێت. دوو هەبوونی بنەرەتی کە رەوابونی یەکتری دەناسن، "ئەنتیتە"کانی لەناو ئاشتیدا پێکەوە دەژێن و ئەو ململانێیانەی لەناو شەردا نییە بەبنەما وەردەگیردرێت و ئەوەش پێشنیاردەکات.

تایبەتمەندی سێیەم، پەیوەست بەهەر دوو رەگەزەکانی سەرەتاوە، پێشنیاری دیستلێبەرنەدراوی دەزگای سیاسەتی دیموکراتی دەکات. زەمینەی چارەسەری بۆ هەموو ئەو کێشانەی دەردەکەون و ئەوانەش کە هەنە، سیاسەتی دیموکراتیە. دانوستاندنی دیموکراتی و دیبلۆماسیەتیش لەناو سیاسەتی دیموکراتی دانە. بۆ ئەوەی سیاسەتی دیموکراتی بەرێوەبچێت، پێویستە هیچ کۆسپ و تەگەرەیەك نەهێڵدرێت. ئازادی بیروڕای بەرفرەوان، پارتی، کۆپەراتیفی"ئابووری هاوبەش"ی بەپێکهاتەی دیموکراتی و هەبوونی هەموو جۆرەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، بەتەنها دەکرێت بە نەهێشتنی ئەو کۆسپ و تەگەرانەی کە هەیە. لە هەڵبژاردنەکاندا یان زۆر هێنانە خوارەوەی یانیش بەتەواوی نەهێشتنی سیستەمی رێژەیی، پێویستیەکی دەستلێبەنەدراوی سیاسەتی دیموکراتیە.

تایبەتمەندی چوارەم، پێویستە ئەو سیستەمانەی کە پێویستیان بە مافی پاراستنی بنەرەتی بۆ هەردوو ئەنتیتە و هەبوونە سەرەکیەکانی کە پێشوازی لێ دەکات پێشبخرَێت. لە راستیدا ئێمە ئەو هەموو رەگەزانەمان لە بەشی" هەندێك زاراوە، هزراندن و پرەنسیبەکان" لە راپۆرتی ـ نەخشەی رێگادا، ویستمان بەشێوەیەکی هێشتا بەرفرەوانتر پێناسەبکەین. لێر تەنها بەشێوەی مۆدێلەکەی چۆن دەربازی پراکتیك بکرێت پێشکەش دەکەین.

4 ـ چارەسەری دیموکراتی یەکلاکردنەوەی لەئاستی ناودا : KCK

دەتوانین چارەسەری دیموکراتی لەئاستی ناویشدا یەکلای بکەینەوە. دەزگا و سنورەکانی کۆماری تورکیا، بەرەوا پەسند دەکرێت. کێشەکانی چۆنیەتی وەکو ناوەندیبوون"ئونیتەر"، بوونە فیدراڵی و کۆنفیدراڵیش گفتوگۆ ناکرێت، پێشنیاریش ناکرێت تاکو ببێتە رۆژهەڤیش. ناوەرۆکی دیموکراتی، ئازادی و یەکسانی هاوڵاتیانی کۆماری تورکیا، بەتەنها لە دەستور و یاسایەکاندا نا، بەڵکو وەکو دەزگاش پێشنیار دەکرێت بخرێتە واری کرداری. بۆ لەیەکتری جیانەکردنەوەی ماف و

ئازادیەکانی تاك و ماف و ئازادی کۆلەکتیف، ناسنامەی کلتوری کراوە دەستنیشان و پێشنیار دەکرێت. رەگەزەکانی سەبارەت بەچارەسەری کێشەی کورد، وەکو پارچەیەکی دەستلێبەرنەدراو دیموکراتیەت، تاکو بەو رەوشەی هەیەتی وەکو بنەماکانی هەڵسەنگێندرێت و پێشنیاردەکرێت. چارەسەریەکە ناوەندەکەی دەوڵەت نییە، سیستەمی دیموکراتیە کە هەموو کۆمەڵگا دەخاتە ناو خۆی و بە بنەمای وەردەگرێت. رەگەزەکانی پێویستە لە سیستەمی دیموکراتی تێبگەین، لەبەر ئەوەی لەبەشی"چەمك، هزراندن و پرەنسیبە"کاندا و بەشەکانی دواتریش بە بەرفرەوانی شیکار کراوە، پێویست بە دووبارەبوونەوە ناکات. بەلام وەکو بۆ زیاد کردنێك، لە ئاستی ناودا یەکلاکردنەوەی لە"KCK" کۆما جڤاکێن کوردستان دا دەستنیشان بکرێت. بەردەوام دەستنیشان دەکرێت پێویستە وا بیرنەکرێتەوە کە"KCK" وەکو بەشێوەی رووخاندنی"کۆماری تورکیا" یانیش ئەلتەرناتیفیەتی. چ لەلایەنی ناوەڕۆك چ لەلایەنی شێوەدا، هەردوو پێکهاتەکەی جیاوازن. کۆماری تورکیا بە پرەنسیب و دەزگاکانی، بە مێژوو و ئێستایەوە شیکارکراوە. هیچ پێویست بە دووبارەکردنەوە ناکات. "KCK"ش چ لەئاستی پێناسکردن و چ لە ئاستی پێشکەوتندا پێویستە لەسەری بە وەستێنرێت. دەتوانین پێناسەکەی وەکو رێکخستنی چەتر یان رەگەزی مۆدێرینیتەی دیموکراتی کوردان کەپێکدێت لە گوزارشت کردن لە"نەتەوەی دیموکراتی کە لە کۆمەڵەی ژینگەپارێز ـ ئابووری، هاوڵاتیانی دیموکراتی و ناسنامە کلتوریە کراوەکان پێکدێت".

دەستەواژەی هەستیار لێرەدا"هاوڵاتیانی دیموکراتین" و "نەتەوە". باوەڕدەکەم لەسەر هاوڵاتیانی دیموکرات گفتوگۆیەکی زۆر پێویست ناکات. بەشێوەی تاکەکانی خاوەن ماف و ئازادی تاك و کۆلەکتیف پێناسەبکرێت، باوەڕدەکەم ناڕازی بوونێکی ئەوتۆ دروستناکات. لەوانەیە نەتەوەی دیموکراتی هەندێك ئالۆز ببیندرێت. بەڵام پێویستە لەبیرنەکرێت کە پێناسەی نەتەوە کە یەکێتی ئەوروپا لە شەڕی نەتەوەکانی پێنج سەدساڵی دوایی دەرخستووە، نزیکی ئەمەیە. نەتەوەپەرستیەتی دەوڵەتی کوردی لەرۆژی ئەمڕۆشدا، لەبەر چەقبەستبوون و کێشەکانی بۆی کراوەن، بەخێرای نەرم دەکرێن و تێدەپەڕێندرێن. لەچەمکی نەتەوە نوێکاندا کە پێشدەخرێن، بەردەوام لەسەر تایبەتمەندی دیموکراتی دەوەستێندرێت. لە کۆماری تورکیا ئەو پێناسەیەی مستەفا کەمال کە دەڵێت" بە خەڵکی تورکیا دەگووترێت میللەتی تورك" پێویستە مرۆڤ بە لایەنێك نە بەدوو لایەن تەماشای بکات، ئەوا هێشتا چارەسەر ئامێزترە. بەتایبەتیش بەکارهێنانی دادگای دەسەڵاتداریەتی پیاو سالاری و ئەو داداگا شۆڤێنیە بێ سنورانەی کە لەسەر دەستەواژەی نەتەوەی تورك باردەکرێت، زەحمەتردەبێت. وەرچەرخاوەتە ئەو دەستەواژەیەی کە بەشداربوونی ناسنامەکان تر تا دەچێت زەحمەتردەکات. لەبەرئەوەش"گەلانی تورکیا" کە پێشنیاری منە، نزیکی پێناسەی نەتەوەیە کە لە ناسنامەی کراوەو هاوڵاتیانی ئازاد و یەکسان و دیموکرات پێکدێت و گوزارەی لێ دەکات. لەبەر ئەوەی لەو کاتەشدا ئەو دەستەواژەیە گوزارشت لە زۆر ئەتنیکی دەکات. دەستەواژەێك کە وەکو کۆسپێك لێهاتووە، پاراستنی بە نەزانی پشتیوانی چارەسەری ناکات.

بەشێوەیەکی وایە کە مرۆڤ دەتوانێت"KCK" بۆ کورد دیموکراتیبوونی کۆمەڵگای مەدەنیش پێناسەدەکات. "KCK" وەکو رێکخستنێکی چەترئاسا بۆ کۆمەڵگای مەدەنی، بەڕاستیش دەتوانێت بەگوێرەی ناوەڕۆکەکەی لەناو یەکبوونی"گەلی تورکیا" یانیش"نەتەوەی تورکیا" بەجێ بەبێت. بەڕاستی ئەگەر بەدڵ باوەڕی بە پێویستی هەبوونی لەناو گەلی تورکیا یانیش لەناو نەتەوەی تورکیا بەڕێوەدەچێت یانیش پەسند دەکرێت، ئاشکرایە کە پێناسەیەکی گونجاو نەرم پێویستە لەو لایەنەدابێت. بەتەنها بەم پێناسەیە نەتەوە نەرمە، دەتوانێت رێگا لەپێش هێزی بەرهەمهێنانی کێشەکانی چارەسەری بەشێوەی فیدراڵی و نزیك بوونی لەناوبردن و نکۆڵیکردن بگیردرێت. شتێکی کەوا ماوەیەکی درێژ رێگا لە جیاکاری و دەرگای توند و تیژی بگرێت، دیسان ئەو نەتەوە نەرم و رێکخستنە چەتر ئاسایە. ئێمە لە مێژوو ئەو شتانەی رۆژانە روودەدەن زۆرباش دەزانین کە چارەسەری بەهێزی سەربازی و فیدراڵی، وازبێنین لە هەبوونی هێزی چارەسەرکردنی کێشەکان، بەتەنها بۆ خۆیان دەرگا بەردەوام لە رەوشی شەڕ و جیابوونەوە بەکراوەی دەهێڵینەوە. کورد لەو رەوشەی تیاشیدان بەخۆیان مافە کۆلەکتیەفەکانیان بەرەو پێشەوە بردوە، وەکو تاکیش لە ئازادبووندا ئاستێکی باشی پێکهێناوە. شتێکی لەمە هێشتا دواکەوتووتر داسەپاندن، ئەوا رێگا لەبەردەم توندو تیژیەکی هێشتا فرەوانتر و جیابوونەوە بکاتەوە، ئەوەی راستی بێت ئەو رێگایەی کە لەلای ئەوانەوە کراوەیە پێویستە بەشێوەیەکی خێرا و بەهێزتر بەرەو دۆڕان بچێت، قسەکردن لەو بارەیەوە راهیبایەتی نییە. بەڕێوەبەرایەتی فیدرالیزمی کوردستان ئەوەی لە باکوری عێراق تائاستێك گوزارشت لەو راستیە دەکات. ئەنجامی سیاسەتکانی نکۆڵیکردن و لەناوبردنی لە مێژووی کۆماریشدا لەپێش چاوانن. ئەگەر ئەو قۆناخەی کە زانستی کۆمەڵناسی پێیگەیشتووە لەبەرچاوان بگیردرێت لەسەر چارەسەری"KCK" رابووەستێندرێت، ئەوا تێبگەن کە ئەوە چارەسەریەکە هەمگونجاوە هەمیش بەگوێرەی راستی تورکیای دیموکراتی، کۆماری دیموکراتی و نەتەوەی دیموکراتیە، هەمانکات شیمانەی پێکهێنانی زۆر بەهێزە.

کاتێك چارەسەری"KCK" بکەوێتە واری کرداری، پێشبینیکردن بۆ ئەو پێشکەوتنانەی کە دروستببن بزانرێت. پێویستە ئەو رەوشەی لە دەزگاکانی کۆماردا هەبوونی خۆیان بپارێزن و بەردەوامبکەن. بەڵام رەوشێکی جیاوازتر دروستبووە. بەدەزگابوونی "KCK"ش بەرەو پێشەوە دەچێت. دەوڵەت خۆی وەکو یەکەی ئیداری بەڕیوەدەبات، "KCK" ش خۆی وەکو دەزگای دیموکراتی بەڕێوەببات. بابەت و ئاستی جیاواز و یەکسانیان دەتوانرێت دەربخرێتە روو. کاتێك جیاوازی دروستبوو، لایەنەکانی یەکتری تەواو بکەن گرانتربێت. کاتێك لێکچواندنیش دروستبوو ئەوا پێشبڕکێی ئەرێنی دەستپێبکات. کامەیان بۆ کێشە کۆمەڵایەتیەکان باشترین وەڵام پەیدا بکات، پشتیوانیکردنی پێشدەکەوێت.

لەم مۆدێلە چارەسەریەدا گرنگترین رەگەز، رتکردنەوەو وەکوخۆ لێکردنی ئەوەی تر پێویست ناکات. هەموو چارەسەرە باوەکان، لەسەر بەردەوام رتکردنەوە یان ئەوەی تر وەکو خۆ لێکردن، ماف دانە دەوڵەت و یانیش بەتاك ئاواکراون. هەتا

یەکێکیان نە رووخێت یان وەکو ئەوەی تری لێنێت"لەناو سەردەستدا توانەوە"، لە شوێنی ئەو ئەوەی تر یان هێشتا باشتر دەبیندرێت جێبەجێناکرێت.
لێرەدا بەشی دۆگماتیزمی ئاینی و پۆزەتیڤیست دیاریکەرە، چ لە مێژووداو چ لەرۆژگاری ئەمرۆکەشدا کۆمەڵگایان کردۆتە تۆپەڵەیێك لە کێشە بەو لاوە هیچ ئەنجامێکی تریان نەبووە. داهێنانی نوێی زانستی کۆمەڵناسی، ئاستی نەرمایەتی و بلندبوونی هزری سروشتی کۆمەڵگا دەستنیشان دەکات. بڵاوبوونەوەی پەیوەندی سیمبیۆتیك"سوودوەرگرتنی بەرامبەر" دیاریدەکرێت. دیاریدەکات کە ناکۆکیەکانی ئانتاگۆنیست"پێکەهەڵپژان" ناچاری نییە. دەزگاکانی سیاسەتی دیموکراتی"KCK پێویستە وەکو رێکخستنی چەتری ئەو دەزگایانە بەو شێوەیە بێت" پەیوەندیان لەگەڵ دەوڵەت لە رووخاندن زیاتر، ئەوا دەوڵەت بەرەو سوودمەندترین ئاست و پێویستی ببات، بەوشێوەیە باسکردنی هێشتا راسترە.
هەرچەندە قۆناخی ئالۆزیەکانیش بەرێوەش بچێت، ئەوا دیالۆگی بەهێز لە نێوانیاندا بتوانێت چارەسەری دیموکراتی بەرهەمبێنێت. دەتوانین دەستنیشان بکەین ئەگەر قۆناخەکە بەرەو پێشەوە بچێت، ئەو شێوە دەزگایانەی کەلەسەر پێیان بمێنن، ئەوانەن کە پێویستن و سوودیان هەیە، پێگەی خۆیان دەپارێزن، پێشبکەون و بەردەوام بکەن، ئەوانەی پێویست ناکەن هیچ سوودیان نییە، ئەوا تێبەپڕێندرێن. خۆی لەخۆیدا ئەو ئەنجامەی لە میکانیزمی دیموکراتیش چاوەڕێ دەکرێت ئەمەیە.

5 ـ رەهەندەکانی پێکهێنانی شیمانەی چارەسەریەکانی"KCK"

کاتێك ئێمە رەهەندەکانی پێکهێنانی شیمانەی چارەسەریەکانی"KCK" دەستنیشان بکەین، بابەتەکانی هێشتا زیاتر روون بکرێنەوە:
أ ـ رەهەندی ئابووری: خەباتێکی بەرفرەوانی"KCK"لەسەر گۆڕەپانی ئابووری بەڕێوەبچێت. لە بەرامبەر کاریگەریەکانی قازانجەکانی رەگەزی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری و کاریگەریە رووخێنەرەکانی لە سەر ژینگە، ئەوا لە رەوشی پاراستنی کۆمەڵگا و ژینگەدابێت. ئەمانەش سەرەتا لە کۆمینە ئابووری و ژینگەپارێز، قازانج بەبنەما وەرناگرێت، دەبێتە وەڵامدەرەوەی پێویستیەکانی کۆمەڵگا و بەڕێوەبردنی ئەو تیمانەی کە ژینگەپارێزن. رێگا لە تاڵانی قۆرخکاری لەسەر بازاڕی کۆمەڵگا بگرێت. رەگەزەکانی سەرمایەداری لەناونەبردرێن، بەڵام زۆر سنورداربکرێن. خەباتکردن لەکۆیلایەتی رزگاری ببێت، بۆ رەوشێکی وەکو پەرستنی ژیانی لێ بێت. دیوارەکانی بێگانەبوون کە لە نێوان خەبات و ژیاندا دروست کراون، برووخێندرێن. لە جیاتی ئەو سیستەمی کە هەرشتێکی کۆمەڵگا دەکاتە کاڵا و کۆمەڵگا لەناو کاڵابووندا دەخنکێنێت، ئەوا پێشینە بداتە ئەو سیستەمە ئابووریەی کە پشت دەبەستێتە بەهاکانی بەکارهێنان و گۆڕانکاریە ناچاریەکان. زەمینەی ژینگەپارێزی و کۆمەڵایەتی کە"KCK"پشتی پێدەبەستێت، ئەم سیستەمە وەکو رۆبێکە کەبۆی دروابێت. ئەوەندەی لەناوبردنی بێکاری کە زۆر بڵاوبۆتەوە، چەمکی ئەخلاقی کە خەباتکردن وەکو ئازادی هەڵدەسەنگێنێت، ئەوا پێشوازی لە هەموو هیواو پێویستیەکانی کە کۆمەڵگا هەستی پێدەکات بکات.
ب ـ رەهەندەکانی کۆمەڵگا: سیستەمی"KCK" لە وەڵامدانەوەی پێویستەکانی کۆمەڵگا لە گۆڕەپانەکانی وەك پەروەردە، تەندروستی، وەرزش، هونەر و حقوقیش، شێوەی بەرهەمهێنانی گونجاون. لەو گۆڕەپانانەش کە لەگەڵ دەوڵەت لە پێشبرکێ و پەیوەندی بەرامبەر"پەیوەندی سیمبیۆتیك"پێکبێت، کاتێك بەرچاوان بگیردرێت، دەزگاکانی کۆمار ئەوەی تائێستا لێیان چاوەڕێ دەکرا نەیانکردوە، رەهەندی کاریگەریەکانی"KCK" هێشتا باشتر بزانرێت. وەکو باوەڕدەکرێت پێچەوانە، لەو گۆڕەپانانەدا زمان و ئەتنیك کێشەی زۆر دروستناکەن. فرە زمانی لە پەروەردەدا وەکو پێویستی کۆمەڵگا، رەوشێکە پێویستە پشتگیری لێ بکرێت. ئەوەندەی تورکی بەرەو پێشبردنی زمانی کوردی و زمانەکانی ترو بەکارهێنانیان لە پەروەردەدا، بەراستیش بەبێتە واتای دەوڵەمەندی بەرهەمهێنان. لەم گۆڕەپانەدا بۆ شۆڤێنزم و خۆداسەپاندن شوێن نییە. بەرەوپێشبردنی دەزگاکانی پەروەردەی، تەندروستی، وەرزش و هونەری کوردی خاوەن ناورۆکێکی نەتەوەی دیموکراتیە، ئەوا وابکات کە لە ناوەڕۆکدا یەکبوونێکی نەتەوەی پێکبێنەو دەوڵەمەندی بخاتە سەر ئەم هەوڵە. هەمان پرەنسیب بۆ کلتورەکانی تریش دەتوانرێت دەستنیشان بکرێت. ئەگەر ئێمە گەلی تورکیا یانیش نەتەوەکەی وەکو یەکێتیەکی دەوڵەمەندی کلتوری شرۆڤە بکەن، ئەوا ببیندرێت کە زۆر رەگەز کە بەمەترسی دەبینرێن وەك"هێڵی سوور" باوڕدەکرێن، لە پێشینە حکومی دۆگماتیك، موحافەزەکار بەولاتر شتێکی ترنییەو خزمەت بە پێشکەوتن ناکات. هەڵوێستێکی تر کە یەکگرتنی ئارەزومەندانەی نەتەوەیی بەهێز نەکات بیری لێ ناکرێتەوە.
ج ـ رەهەندی ئاسایشی: رەهەندێکیش کە زۆری لەسەر گفتوگۆ بکرێت و بریار و یاسای لە سەر پێویست دەکات، ئەوا دەربارەی گۆڕەپانی ئاسایشی بێت. لە ئازادی دوور بوونی کوردان لەولاتر، لە بەرئەوەی وەکو هەبوون بەردەوام لە کەنار و لەناو مەترسیدا دەژن، ئەوا ئاسایشێکی باشیان بوویت، هەروەها لە چارەسەری بەدەزگابووندا پێداگری بکەن. سوپا کۆمار لەبەرامبەر مەترسیەکانی دەرەوە دەپارێزێت، بەڵام پێویستە لە بابەت هەبوون و ئازادی کورداندا وەرچەرخانێکی رادیکاڵ بکات. بۆ دەزگا ئاسایشەکانی تریش هەمان نزیکاتی دەربازدەبێت. تاکو ئەو گۆڕانکاریانە ئەنجامدەدرێن، "KCK" پێویستە هێزەکانی پاراستنی بنەڕەتی خۆی بپارێزێت. بەتایبەتی تاکو جاشایەتی، ئەو رەوشەی

هەیانە لەگەڵ ژیتەم و گرووپەکانی سەربازی بەپارەو "هەندێك لەوانەی ئەرگەنەکۆنیش لەناودا"ئەوانی هەبن، هێزەکانی پاراستنی بنەڕەتی "KCK" وەکو دەستلێبەرنەدراوی ژیانی دیموکراتیبین. پێویستە بەجێبوونی سوپا لەکوردستان بەمەبەستی هەڕەشەکانی دەرەوەبێت، کورد وەکو رەگەزێکی سەرەکی یەکبوونی دەوڵەت و نەتەوەی پەسند بکرێت، واز لە نزیکایەتی وەکو سەرچاوەی هەڕش دیتن بهێندرێت. بۆ تێپەڕاندنی بیرەوەریە بەئازارەکانی لەو لایەنەوە کەلەمێژووی کۆماردا بەڕێوەچوونە، پێویستە هەوڵدانێکی پێکەوەی بەڕێوەبچێت. "KCK" دەتوانێت بۆ هێزەکانی پارستنی بنەڕەتی چارەسەری جۆراوجۆر بەرهەم بهێنێت. دەتوانێت بیر لە ئاستی کاتی بوون و بەردەوامیش بکاتەوە. لە چوارچێوەی سوپا و هێزە ئاسایشیەکانی تردا، وەکو کوردەکانی عێراقیش نەبێت، بەشێوەێك ببێتە پارچەێك لە ئاسایشی هەرێمەکە، دەتوانرێت لەو بارەیەوە گۆرانکاری ئەنجامبدرێن.

د ـ رەهەندی دیبلۆماسی: کێشەی هەرە گرنگ لەم رەهەندەدا، لەسەر بنەمای دژایەتی میساقی میللی سەبارەت بە چۆنیەتی سەیرکردنی پارچەبوونی کورد و کوردستان و چارەسەریەکی چۆن پێشنیار دەکرێت. هەڵبەتا تورکمان، هەتا ئەرمەنی و سوریانیش لە ناو ئەم مەسەلەیەدان. رەوشی ئەوان چ سیاسەتی ناوخۆ و چ سیاسەتی دەرەوەش زۆر کاریگەر دەکات. گۆڕانکاریەکانی لە عێراق و ئەرمەنستان هەتا دوای ئەمە شیکار دەکات. گرنگی گۆڕانکاریەکانی لە سوریاش دەبێ بچوك نەبیندرێن. خۆی لە خۆیدا ئێران هەموو جیهان پەیوەندیدار دەکات. پێویستە مرۆڤ تەماشای نەکات وەکو خەڵکێك لە دەرەوەی رێکەوتنی قەسری شیرین لە ناوەراستدا بمێنێتەوە. نەبوونی کات زەحمەتیمان بۆ دروست دەکات. ئەو هەموو بابەتانە لە گشتی رۆژهەڵاتی ناویندا ناچاری بیرلێکردنەوەو چارەسەری بۆ ئافراندنیانین. "KCK" لە گشتی رۆژهەڵاتی ناویندا نمونەیەکی هەرە باش لە بەرهەمهێنانی چارەسەری پێشکەش دەکات. راستریش لە چوارچێوەی جیاوازی ئاینزای، ئەتنیکی و نەتەوەیدا سیستەمێك کە کێشەیان چارەسەر دەکات پێشنیار دەکات. لێرەدا ئەو مۆدێلەی بیری لێ دەکرێتەوە، سیستەمێکە کە سنوری سیاسی ناهێڵێت، دەرگا لە پێش چارەسەری سەربازی ناکاتەوە، هەتا بەتەنهاش بۆخۆی فاشیزم داناسەپێنێت. ئێمە باسی پێشخستنی شێوازێك لەناودا، زۆرێك لە شێوازەکانی چارەسەری کە لە جیهاندا پێشکەشکراون لەبەرچاویان دەگرێت، بەڵام خاوەن تایبەتمەندی خۆیەتی دەکەین. "KCK" ئەم پێویستیە لەبەرچاو دەگرێت. لە چوارچێوەی یەکێتی نەتەوەی تورکیادا، دەتوانێت وەکو رێکخستنێکی چەتر کە هەموو کوردانی رۆژهەڵاتی ناوین، ئەرمەنی، سوریانی و تورکمانەکانیش بخاتە ناوخۆی، بەرفرەوان بکرێت. مەرج نییە دەوڵەتان بخاتە ناو خۆی. دەوڵەت دەتوانن لەناو خۆیاندا یەکێتیەکی وەکو یەکێتی ئەوروپا پێشبخەن. بەتایبەتی بۆ تورکیا، سوریا و عێراق دەتواندرێت کۆنفیدراسیۆنێکی سست پێشنیار بکرێت. ئەو مۆدێلە هەتا بچێت دەتوانێت لە رۆژهەڵاتی ناویندا بەرفروان بێت و قوولتر ببێتەوە. مۆدێلی چارەسەری "KCK" وەکو مۆدێلێکی دژی یەکێتی دەوڵەتان نا، بەڵکو وەکو یەکێتیەکی کۆمەڵگای مەدەنی، کۆنفیدرالیزمێکی دیموکراتی کە لە پێویستی کۆمەڵگاوە دروستبووە، لەگەڵ ئەوان یەکتری تەواودەکەن، دەبێ بیری لێبکرێتەوە. پراکتیکەکانی رۆژهەڵاتی ناوین، سەبارەت بەکاروباری دیبلۆماسیەکانی دەوڵەتان ئەو کێشانەی چارەسەرناکرێن، وانەی زۆرمان پێدەدات. لە یەك ئاستی یەکساندا پێشخستنی یەکێتی ئەوروپا ئەوەندەی کۆنفیدراسیۆنی دەوڵەتان، کۆنفیدراسیۆنی کۆمەڵگای مەدەنیش بەهادارە. پێویستی کۆمەڵگاکانی سەروو نەتەوە لەرۆژی ئامرۆدا، رێکخراوبوونی هەماهەنگی لەو لایەنەدا دەستلێبەرنەدراوە. لەراستیدا رۆژهەڵاتی ناوین لە کۆنفیدرالیزمی دەوڵەتان و کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی کۆمەڵگای مەدەنیدا لەیەك ئاستی یەکساندا پێشخستنی، گرنگ و پێویستە، پێویستە پێکەوەو بە شێوەیەك یەکتری تەواوبکەن پێشبخرێن، بەو شێوەیە کێشەکانی لەو لایەنەوە چارەسەر بکات.

بۆ "KCK" دەتوانین باسی رەهەندەکانی تریش بکا. بەڵام لەبارەی ئەو پێشکەوتن و پراتیکانەی کە دروست بین، ئەو ئاستانەی دەستنیشانکراون، لەئاستێکی پێویستدا روون دەکرێنەوەو پێشنیار پێش دەخرێن. بێگومان بۆ هەر ئاست و گۆڕەپانێکی تر، کێشەی دەستور و یاسای و زۆرێك لە کێشەکانی لە پەیڕەوی ناوخۆدا هەیە، پێویستە چارەسەربکرێن. لەو لایەنەوە لەگەڵ هێزەکانی ئاسایشی دەوڵەتدا، دیالۆگی بەرفروان پێویستن، ئەمەش پشتیوانی بداتە چارەسەری هاوبەش. ئەو خەباتانەی لە ئاستی حکومەت و پەرلەمانی تورکیادا بکرێن، ئەوا لە چارەسەریدا رۆڵی کلیل ببینێت. وەکوتر بەتەنها دیالۆگ و کاری هاوبەش لە ئاستی دەزگاکانی دەوڵەتدا بەش ناکات، بەهەمانشێوە بەتەنها هەوڵەکانی حکومەت و پەرلەمانی تورکیاش. رۆڵی گرنگی رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و پارتیەکانی بەرهەڵستکار کە پارچەێکن لێی هەبێت. بەتایبەتی خەباتی رای گشتی پێویستە. دەزگاکانی راگەیاندن و میدیاکان، لێرەدا رۆڵێکی ژیانی دەبینن. پشتیوانی زانکۆکان و جیهانی ئەکادیمیاش دەبێ بچوك نەبیندرێت. پشتیوانی لە سەروویاندا ئەمریکا و ئەوروپا ئەو هێزانەی لە زۆر ئاستی چارەسەریدا، تەنها نە لەئاستی لایێك بەڵکو هێزە نێونەتەوەیەکان تر کە خاوەن ئەزموونن و دەتوانن پشتیوانی بدەن دەبێ چاوڕێشیان بکەین.

ئەو هەڵسەنگاندنەی کە سەبارەت بە کرانەوەی دیموکراتی لە تورکیا و مۆدێلی چارەسەری بۆ کێشەی کورد هاتنە کردن، پێویستە وەکو تێروانینی سەرەتایی و پێشنیار تێبگەن. هەموو لایەنە پەیوەندیدارەکان بیروڕاو پێشنیارەکانی خۆیان پێشبخەن، وەکو پێویستی بەرپرسیاری کە دەکەوێتە سەر شانی من، ئەو گەلالە پێشنیارە لەلایەن منەوە پێشکەش دەکرێت. ئەوەندەی گفتوگۆ و پێشنیار پێشبکەون، هەڵبەتا ئەوا پشتیوانیەکانمان بە شێوەی جۆراوجۆر بابەتی قسەکردنە.

بۆ دوای ئەوەش بەو شێوەیەی پێویستە لەکوێ و چۆن دەستپێبکرێت، پێویستی بە بەرنامەو پلانێکی چالاکی هەیە داخۆ لەپراکتیکدا چۆن پێکبهێندرێت. بەشی دوای ئەوا پێشنیارەکانم بۆ پلان لەو لایەنەوە پێشکەش بکەم.

بەشی پێنجەم: پلانی چالاکی

لەکێشەکانی کۆمەڵگادا هەر مۆدێلێکی چارەسەری کە پێشنیار دەکرێت، ئەگەر گوزارە لە بەهایەکی پراکتیکی نەکات،

لەبوونی جوملاستیکی هزری بەولاترەوە ناچێت. هەڵبەتە هەنگاوی پراکتیکیش بە هزراندن پەیوەندیدارە، ئەوەی بەرێوەدەچێت هزراندنە. هەروەها بەهای لێکۆڵینەوەی سەرکەوتوو، بەتەنها لە پراکتیکدا دەتوانێت وەڵامی خۆی پەیدا بکات.

بەناوی خۆم لە بابەت چارەسەری کێشەی کورد، زۆر بە سادەیش بێت، هەنگاو هاویشتنی پراکتیکیش لە چالاکی یەك لایەنە، هێشتا گرنگترە. بەردەوام باوەڕ بەوەدەکەم کە پێویستە بەردەوام رێگا لە دیالۆگی واتادار بکرێتەوە. بەڵام ئەوەش دەزانم کە بەناوی دیالۆگەوە یەکتری هەڵخەڵەتاندن ماڵوێرانی بێنێت. پێویستە ئاستی دانوستاندنی لایەنەکان بچووك نەبیندرێت. بچوکترین زەمینی دانوستاندن، لەچالاکیەکی بە"هێز"ی زۆر گەورە و سەرکەوتوو ئەنجامدرا، هێشتا بەنرختر ببیندرێت.

لەبابەتی کوردا لە ساڵانی"1970"دا لە قۆناخی لەدایك بوونی"PKK"دا، سیاسەتێکی نکۆڵی کردنی زۆر توند جێبەجێدەکرا. بە زارەکیش لەبەرامبەر ئەو سیاسەتە دەرکەوتن، بە سزای زۆر گران وەڵامی خۆی وەردەگرت. هەر لەو قۆناخەدا لەگەڵ گرووپە چەپەکان بەهاوبەشی چارەسەری دیموکراتی لەپێشینە دەناسرا. هەڵبژاردنم بۆسەرۆکایەتی"ADYOD"(کۆمەڵەی فێربوونی بلندی دیموکراتی لە ئەنکەرا - 1975) بەو مەبەستە بوو. کاتێك بەرێوەنەچوو، چوون بەرەو دەرکەوتنی"PKK"دەستلێبەرنەدراوبوو. چوون بەرەو قەڵەمبازی "15ی ئاب" دیسان لەبەرامبەر سیاسەتی نکۆڵیکردن و لەناوبردندا تاکە ئەلتەرناتیف بوو. هەرچەندە وەکو دەمووویستیش نەبێت، بەهەموو هێزو توانامەوە لەسەری وەستام. من خۆم لەمە دوور نەخست.

ئەگەر ئەو کەشەی بۆ دیالۆگ کە لەلایەن بەرێز سەرۆك کۆمار تورگووت ئۆزاڵەوە لە سەرەتای ساڵانی"1990"وە پێشکەش کردبوو هاتبووایە پێشخستن، لەوانەبوو ئەمڕۆ کێشەی کورد لە ئاستێکی زۆر جیاوازتردا بووایە. دەوڵەتیش بۆ سەرۆکەکەی دەرفەتی دیالۆگ و دانووستاندنی نەدا. پراکتیکی نکۆڵیکردن و لەناوبردنی باو بەهەموو هێزی لەجموجۆڵ دابوو. بەقۆناخێکی زۆر تاریکی مێژووی کۆماردا تێدەپەڕین. ئەو ئەزمونەی دیالۆگ کە لە بەرەی سەربازی و سیاسی لەساڵانی"1997 - 1998"دا نزیکبوونەوە، رووبەڕووی هەمان چارەنووس بوونەوە. کۆسپەکانی ناوخۆ و دەرەوە، بەکورتی گلادیۆی کە لەسەر هەموو پێکهاتە سیاسی و سەربازیەکان بە کاریگەرە، لە ئاستێکی زۆر ئاسایش بۆ دیالۆگ و دانوستاندن دەرفەتیان نادا. لەگەڵ هەموو هەوڵدانەکانم لە بابەتی بتوانم قۆناخی لێکۆلینەوە لەگەڵ کردنم لە ئیمراڵی وەکو زەمینەی دیالۆگ و دانووستاندن هەڵسەنگێنم، بەردەوام هەندێك خراپیان کرد. هەموو پێشنیارەکانم بێ وەڵام مانەوە. دیارە کە هەتا لە دوایدا پاکتاوکردنی بزووتنەوەکەمان پیلاندەکرا. پێکهاتەکانی کە دیالۆگ و دانوستاندنیان وەکو کۆتای هاتن بەخۆیانەوە دەدیت هەبوون. ئەوانە زۆر سەرەنجراکێش ئامادەکرابوون، لەناو دەوڵەتدا ببوونە دەوڵەت. ئەوە لەناو بەشەکانی کە نەخۆشی دەسەڵاتداریەتی بەرەو بڵاوبوونەوەیان دەبات، ئەوانەی هەرە مەترسیدار و بێ بەزەی بوون. سەرەڕای هەموو هەستیاریەکانم، دیسان هەزاران مردن و گیان لەدەستدان و زیانی مادی بێ هژمار پێکهات. وەکو تاك لە ساڵانی"1990" بەدواوە هەوڵم دەدا شەڕ سنورداربکەم. بەڵام کاتێك ئەمە ئەنجامی نەگرت، سەرەڕای ئەوەی نەخوازراویش بوو، ناچاربووم کە ئەوە دەستنیشان بکەم و دیاربکەم وەکو ئاگاداری دوایی، لەئاستی کورد و کوردستاندا بە مەبەستی" پاراستنی هەبوونیان و پێکهێنانی ئازادیەکانیان" ئێمە نزیکی قۆناخێك بووینەوە کە بەهەموو خێرایەك کە لەناویدا بەرخودانی هەمەلایەنە دەستلێبەرنەدراوە بەرێوەبچێت. زەمینەی دیالۆگ و دانوستاندنەکان لەبەر ئەو هۆکارانەی شیمانە دەکرا لەو لایەنانەوە پێك بێن، دستنیشانکرا.

لەنێوان لایەنەکانی شەڕدا نەوەك پلان نەبووە. پلانی چالاکیان، زۆرترین کارە کە لەسەری دەوەستێندرێت و جێبەجێدەکرێت. لەبەر ئەزموونەکانم، هەبوونی ئەو کارانە باش دەزانم. پلانی چالاکیە یەکلایەنەکان بە ئارەزوو دەکرێن. ئەوەی زەحمەتە، پلانی ئەو چالاکیانەیە کە لایەنەکان بگێنێتە پێشخستن. تاکو خۆ خستنە شوێنی نەبێت"ئەمپاتی" بەرامبەر نەبێت، پلانی بەو شێوەیە پێشناکەون. لەگەڵ هەڵسەنگاندنێکی کورت سەبارەت بە پلانی چالاکیان کە یەکلایەنە بەرەو پێشەوە دەچن و هێشتاش پێك دەهێندرێن، سەبارەت بە پلانی چالاکیەکان کە رێگا لەپێش سازشکردنی هەردوو لایەنان بکاتەوە، تێڕوانینەکانم پێشکەش دەکەم. لەسەرەتاوە نیشانبدەم کەوەك لایەنێك من خۆم لە پێکهێنانی پلانەکاندا بەرپرسیار نابینم. لەبەر ئەو رەوشەی زیندان کەوا من لەناویدام مەرجەکانی پێکهێنان لەوانە نییە دەرفەت بدات. ئەو تێڕوانینانەی کەوا من پێشکەشی دەکەم هێشتا زیاتر لایەنەکان بەشێوەیەکی راست یەکتری بناسن و سەبارەت بە پلانی چالاکییە هاوبەشەکانی کە دروستببن، سەبارەت بە ئەوانەی دروست دەبن و ئەوانەش دروست نابن روونکردنەوەی دەکاتە ئامانج.

بۆ ئەمەش:

1 - پلانی چارەسەری نکۆڵیکردن و لەناوبردنی باو: وەك رابردووش نەبێت هێشتا پلانی لە چوارچێوەی ئەو چارەسەریدا پێشدەخرێن و جێبەجێدەکرێن ئەوەش بابەتێکی قسە لەسەرکردنە. ئەو توێژە لە بوورژوازی چینی ناوین و بیرۆکراسی کە پشت دەبەستنە قازانجی دەوڵەت و دروست دەبن، بنچینەکەیان چینایەتیە، سەرەڕای ئەوەی لە ناوەوە لە دەرەوە زۆر گۆشەگیر و ریسواشکراون، لە جێبەجێکردنی پلانی لەناوبردنی بە شێوازی دزی و لە ژێرەوە و قەبە ناترسن. هەموو کورد لە دەرەوەی توێژی باو لە کوردی بەکرێگیراو، لەبەرامبەر جێبەجێکردنی ئەم پلانەدا بە بەرفروانترین بەرخودانی مێژووی وەڵامدەدەنەوە. "PKK" کە لەئاستی پێشەنگایەتی بەرخودانەکەدایە، ئەوەندەی کە ئەو پلانە بەردەوام بکەن خاوەنی هێزێکی وایە کە دوای ئەوانەش پلانی چالاکیەکانی بە بەرفرەوانی جێبەجێ بکات. لە ئاستێکی وا دایە کە لە پلانی پارستنی پاسیف"نەرم"، بەرەو پاراستنی ئاکتیف"توند" و پلانی بەرخودانی هەمەلایەنە بچێت. لە ماوەی داهاتوودا لە بەرامبەر چەقبەستبوونی جدی کە لە چارەسەری دیموکراتیدا رووبدەن، لەوانەیە دەربازی

پلانی پاراستنی هەمەلایەنە بین.
2 ـ پلانی چارەسەری فیدراڵی، مللیگەرا: ئەو پلانەش لە ئاست و گۆڕەپانی جیاوازدا جێبەجێدەکرێت. لە پشت ئەو پلانانەی کە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی کوردستانی عێراقەوە دەربازی بواری ژیانی دەبێت، لە گەڵیدا دەوڵەت ـ نەتەوەی باوەکانی ناوچەکە و هێزە هەژمونگەرا جیهانیەکان هەیە. مەبەستی هەموویان جیاوازیش بێت، سازشێکی گشتی جێگای باسە. بەمەبەستی ئەو هێزە شۆڕشگێڕە دیموکراتیەی کورد لەناوەڕۆکەکەی دوور بخەنەوە، پشتیوانی ئەو پلانە دەکەن. ئەمریکا وەك هێزێکی هەژمونگەرا کە بەشێوەیەکی ئاشکرا پشتیوانی لە دەسەڵاتی کوردی فیدراڵ دەکات. لەکۆنتڕۆڵ کردنی عێراق، سوریا، ئێران و تورکیادا، دەسەڵاتی فیدراڵ ڕۆڵێکی ستراتیژی دەبینێت. دەسەڵاتدارانی تورکیا، ئێران و سوریا لە پێناو شکاندنی بەرخودانی کوردەکانی لای خۆیان بەهیچ نەژماردنی کوردستانەکەیان، بەشێوازی جیاواز پشتیوانی دەداتە پلانی"کوردستانی بچووك" کەوا لە شەڕی جیهانی دووەم و بەدواوە لە باکوری عێراقدا تەنگ کراوە. کاتێك کورد بیانەوێت ئەو ڕۆڵەی بۆ ئەو هێزانە گونجاو بینراوە تێیپەڕێنن، ئەو هێزانە هەموو پێکەوە ڕووبەڕووی دەبنەوە.
سیاسەتگەرای و پیلانگێڕیەتی پەرتکە ـ زاڵبە، زیاترینی بە پرۆژەی"کوردستانی بچووك" بەڕێوەدەبردرێت. بەتایبەتی شۆڕشگێڕ، دیموکراتە رادیکاڵ و سۆسیالیستەکان، دەیانەوێت بەم ڕێگایە بێکاریگەریان بکەن. یەکێکیش لە ئامانجی سەرەکی پلانکە، ئیزۆلاسیۆن"دابڕاندن"ی "PKK"یە. لەبەرامبەر"کوردستانی بچووك"دا سەبارەت بە دابڕین و پاکتاوکردنی "PKK" خەباتی گلادیۆی زۆر بەرفرەوان هەیە. وەکوتر ئەو پلانە لە گۆڕەپانی دیبلۆماسی نێودەوڵەتیشدا پشتگیریەکی بەرفروان دەبینێت. بەڕێوەبەرایەتی ئەمریکا ـ تورکیا ـ عێراق کە بەڕێوەبەرایەتی فیدراڵی بەشداری خۆیان کردوە، لە چوارچێوەی ئەو پلانەدا هەوڵدەدەن "PKK" واز لە خەباتی چەکداری بێنێت. بەڵام ئەم پلانە لەبەر هۆکاری بەرژەوەندی جیاوازی لایەنەکان لەئاستی پێویستدا بەڕێوەناچێت، جێبەجێکردنەکەی سنوردارماوە. لەبەر ئەوەی لەلایەن بەشێکی زۆری کۆمەڵگای کوردیەوە پشتگیری ناکرێت، زۆر بەهیوا نییە. لەبەر ئەوەی خزمەتی بەرژەوەندی بەشێکی کەمی سەرەوە دەکات، ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر ئاشکرا دەبێت و ڕووبەڕووی گۆشەگیری دەبێتەوە.
وەڵامدانەوەی "PKK" بۆ ئەم پلانە بەشێوەی" ڕادەستنەبوون و بەردەوامکردنی بەرخودان"بووە. خاوەنی ئەو پلانە زۆر کەسی کە ماوەیەکی زۆر لەناو ڕیزەکانیدا شوێنیان گرتبوو، بێ بڕیار، لەناو لاوازی ئەخلاقی و ئایدیۆلۆژیدا بوون ڕایانکردوەو چوونەتە لایان، سەرەڕای ئەوەی ویستویانە بزووتنەوەیەکی بەکرێگیراو لەوانە پێکیش بێنن، هەمانکات نەیان توانیوە خۆیان لە ئاشکرابوون ڕزگاربکەن. لەبەر هۆکاری لاوازی دابونەریتی مللیگەرای کورد نەی توانیوە پلانی دەوڵەتگەرای ـ نەتەوەی بە بڕیاریش بەرەو پێشەوە ببات، لە ناوەڕۆك دەرکەوتن و پاکتاوبوون بۆتە چارەنوسیان. ئەو توێژانە هەموویان هیواکانی خۆیان گرێداوەتە شکانی بەرخودانی"PKK". حکومەتی تورکیاش ماوەیەکی درێژ هیواکانی لەو لایەنەوە بەکارهێنا. لە مللیگەرای کورد کە پشت دەبەستێتە"کوردستانی بچووك" چاوەڕێیان کردوە. وەکو ئەو پلانەی لەسەر ئەرمەنی و ڕۆمەکان جێبەجێکرا، ویستویانە لەسەر بنەمای"کوردستانی بچووك" لەسەر کوردانیش جێبەجێبکەن. بەڵام جیاوازی هەلومەرجەکان و ئاستی"PKK" ڕێگا دەکاتەوە بۆ پێچەوانە گەڕاندنەوەی ئەو پلانە، ئەوەی بەهێزدەبێت هێڵی"PKK"یە.
3 ـ پلانی چارەسەری دیموکراتی: لەبەر ئەوەی پلانەکانی لەهەردوو مادەی سەرەتا هیوایەکی ئەو تۆیان نەداوە و لە هەموو لایەکەوە زۆر گران بووە، وای کردوە کە کۆماری تورکیا بەرەو پرۆژەی دیموکراتیبوون بچێت. لەبەر ئەوەی پێشکەوتنی سەردەمیانەش لەو لایەنەوەن، پشتیوانی کردنی ئەمریکا و ئەوروپا بۆ لایەنی سازشکردن، بەشێکی گەورەی میدیا، ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و ڕای گشتی و تەواوی کورد کە لەو لایەنەوە نزیك بوونیان نیشانداوە، چاری یەکەمە چانسی جێبەجێکردنی پلانی چارەسەری دیموکراتی زیادی کردوە. لەگەڵ هەموو ئەو ڕووبەڕوو بوونەوەی لایەنی دژی بەرەی نەتەوەپەرست ـ مللیگەرای فاشیست کە کەوتوونەتە ئاستی کەمینە، لەبەر ئەوەی دەزگا سەرەکیەکانی دەوڵەت لەبەرامبەر پرۆژەی چارەسەری دەرناکەون و هەتاکو لە ئامادەکردنی پێکهاتەکانیدا ڕۆڵی گرنگ دەبینن، چانسی جێبەجێکردنی پلانی چارەسەری زیاد دەکات. لەبەرامبەر ئەو ڕەوشە نوێ مێژووییە، ئەو پلانەی چالاکی کە لەنێوان لایەنەکان پێکبێت، پێویستە بە چەند قۆناخێکدا دەربازببێت. ئەگەر لەسەر هێڵە ئەستوورەکانی پلانی چارەسەری دیموکراتی، سازشکردنی دەزگا سەرەکیەکانی دەوڵەت و حکومەت دروست ببێت، لەگەڵ لایەنی کوردیش پشتیوانی هێزە دیموکراتیەکان وەربگرێت، جێبەجێکردن و قۆناخەکانی کە پێکبێن پێویستە بەو ڕێگایانە بەرەو پێشەوە بچێت.
أ ـ قۆناخی یەکەم : "PKK" قۆناخی بێ چالاکی وەکو هەمیشەی ڕابگەێنێت. پێویستە لەم قۆناخەدا لایەنەکان نەکەونە پیلانگێڕیەوە، کۆنتڕۆڵ لەسەر هێزەکانیان هێشتا بەهێزتر بکەن و بەردەوام بکەن تاکو ڕای گشتی ئامادەبکەن.
ب ـ قۆناخی دووەم: بە دەستپێشخەری حکومەت و بە پێشنیارەکانی کە لە پەسەند کردنی پەرلەمانی تورکیا دەربازبووە ئامادەبکرێت، بۆ ئەوەی کۆسپە حقوقیەکان نەهێڵدرێن بتوانێت ببێتە یارمەتیدەر بۆ ئەمەش پێکهێنانی کۆمیسیۆنی حەقیقەت و سازشکردن. لە پێکهێنانی کۆمسیۆندا پێویستە لەنێوان هەموو لایەنەکاندا پەسندکرن لە ئاستی سەرووەدا پێویست دەکات. پەیوەستە بە دانپیانان و پاراستنی کە لەم کۆمسیۆنەدا کراون، ئەوا دەزگایەکی لێبوردن پێشنیار بکرێت و پێشکەشی پەرلەمانی تورکیا بکرێت. ئەگەر کۆسپە یاساییەکان بەو شێوەیە هەڵ بگیردرێن، ئەوا"PKK" هەبوونی لە ئاستی دەرەوەی قانونیبووندا، لە ژێر چاودێری دەستەێك کە لەناویاندا بەرپرسیارانی ئەمریکا، ئەوروپا، نەتەوە یەکگرتوکان، بەڕێوەبەرایەتی فیدراڵی کورد و کۆماری تورکیاش هەیە، ئەوا بتوانێت هێزەکانی دەربخاتە دەرەوەی سنوری تورکیا. دواتر ئەو هێزانە بە شێوەیەکی بە کۆنتڕۆڵ لە گۆڕەپان و وڵاتی جیاوازدا بەجێبکرێن. ئەو خاڵەی لەو قۆناخەدا مەترسیدارە، پلانکردنی بەردانی گیراوانی سیاسی "PKK" و کشانەوەی هێزە چەکدارەکانی "PKK"یە بۆ

دەرەوەی سنور پێکەوە ئەنجامبدرێن. پرەنسیبی" یەك بێ ئەوەی تر نابێت" گونجاوە.
ج ـ قۆناخی سێیەم: ئەوەندەی هەنگاوی دەستوری و یاسای دیموکراتی بەهاوێژرێن، هەلومەرجی دووبارە بەکارهێنانەوە چەك نەمێنێت. لە سەروویاندا ئەوانەی لە "PKK"دا ئەرکیان هەبووە، ئەوانەی ساڵانێکی درێژە لە ئاوارەی دژن، مافی هاوڵاتیبوونیان لێ ستێندراوەتەوەو لە ئاستی پەنابەریدان، بەش بەش دەست بگەڕانەوەبکەن بۆ وڵات. دوای ئەوەی کاروبارەکانی "KCK" یاسای بوون، ئەوا پێویست نەبێت کە"PKK" لەناو سنورەکانی تورکیادا کاربکات. لەهەموو لایکەوە کاری سیاسی ، ئابووری و کلتوریە دیموکراتیەکانی لەگەڵیدا بەبنەما وەربگیردرێت.
بۆ پراکتیزەکردنی ئەم پلانە وەکو قۆناخ، رەوشی عەبدوڵڵا ئۆج ئالان خاوەن گرنگیەکی ستراتیژیە. چانسی بەڕێوەبردنی ئەو پلانە بە ئۆجالان زۆر سنوردارە. لەبەر ئەوەش پێویستە سەبارەت بە هەلومەرجەکانی چارەسەری ماقووڵ پێشبخرێن.
سەبارەت بە رەوشی خۆم ئەو پێشنیارانەی ئەگەر بیانکەم، دەتوانم بەوشێوەیە پێشکەشیان بکەم:
1 ـ لەسەر بنەمای ئەو بەرگریەی کە لە کۆمسیۆنی حەقیقەت و سازشکردندا بیکەم، ئازادکردنمە لەبەر ئەرك و کارکردن.
2 ـ لەچوارچێوەی ئازادیدا، بەڵام لەگەڵ بەرپرسیارەکانی لە سەرەوە ناویان هات، ئەمریکا، ئەوروپا، نەتەوەیەکگرتووەکان، بەڕێوەبەرایەتی فیدراڵی کورد و کۆماری تورکیا، ئەگەر پێویست بێت بە نوێنەری وڵاتان و هێزەکانی تر لەناو رێکەوتندا، لەسەرووی هەموویان"PKK"، هەموو دەوروبەرە دیموکراتیەکانی ئەوەی پەیوەندیدارن بە کوردەوە، بۆ چارەسەری ئامادەبکرێن و لە بابەتی بەگوێرەی پێویستیەکانی پلانەکە جولانەوەو پێویستە ئەرکی بەڕێوەبردنم جێبەجێبکرێت.
3 ـ لەسەرووی هەموویاندا بەجێبوون، بۆ جێبەجێکردنی پێویستیە جیاوازەکانم، پێویستە پشتیوانی بکرێت.
سەبارەت بەچارەسەری و پلانی دیموکراتی کە لەناو رای گشتی تورکیادا و بەشێکی مەزن لە کوردان زۆر گفتوگۆ دەکرێت و چاوەڕێی دەکەن کە لەلای من دەرکەوێتە روو، بەشێوەی رەشنوس من دەتوانم تێڕوانین و پێشنیارەکانم بەم شێوەیە پێشکەش بکەم. دیارە لەسەر بنەمای تێروانین و پێشنیارەکانی کە لەلایەن لایەنەوەکانەوە بێن، دەتوانم تێڕوانین و پێشنیارەکانم بەرچاو دەربازبکەم، بیانگۆڕم و پێشیانبخەم.
دوای ئەوەی من ئەو راپۆرتە ـ نەخشەی رێگایەم وەکو رەشنوسێك ئامادەکرد، هەڵبەتە گرانترین بەرپرسیاری سەرەتا حکومەتی "AKP"، دەکەوێتە سەر شانی پەرلەمانی تورکیا و بەرپرسیارانی دەزگا سەرەکیەکانی دەوڵەت. ئەگەر سازشێکی گشتی دروست ببێت، پێویستە یەکسەر لە قۆناخی سەرەتاوە دەست بەکار بکرێت. ئەگەر پێچەوانەی ئەمە رووبدات، لەگەڵ ئەوەی من هیچ کاتێك نامەوێت، لە سەرووی هەمویاندا"PKKوKCK" ناچاردەبن دەربازی قۆناخی کە پێی دەگوترێت" بۆ پارستنی هەبوونی کوردان و جێبەجێکردنی ئازادی بەرخودانی هەمەلایەنە" ببن. چی دەبێت بابەبێت بۆ ئەوەی رێگا لەپێش ئەمە نەکرێتەوە، پێویستە ئێمە پێکەوە رێگا لە حسابە سیاسیە رۆژانیەکان و بەرژەوەندی دەسەڵاتخوازان بگرین، مۆدێل و پلانی کرانەوەی دیموکراتی و چارەسەرکردنی کێشەی کورد پێکبێنین.
بەشی پێنجەم: ئەنجام
ئەگەر کۆماری تورکیای گەنج لەگەڵ کێشەی کورد بەرەو چارەسەری بچووبوایە، ئەوا بێگومان بەڕێوەبردنی مێژوو جیاواز بوایە. پرۆژەکانی کوێرکردنی رەگەزەکانی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری، لەسەر ئەو بنەمایەی کوردانیش رووبەڕووی چارەنووسی ئەرمەنیان بکاتەوە هێلیان بەژێر داهێنا. رەوشی سیاسی جیهان و لاوازی ئایدیۆلۆژی و رێکخستنی کوردان، جەسارەتیان دایە خاوەنی ئەو پرۆژانە. باوەڕیان وابوو ئەوەی بەسەر ئەرمەنیەکانیاندا هێنا، ئەوا دووبارە بەسەر کوردانیشدا بهێنن. لەلایەن بوورژوازیەتی چینی ناوین و ئەو بیرۆکراسیەتەی کە مێژووی پێش کۆماریان لە مێشکیاندا پاککراوەتەوەو گەورەبوونی کورد دەمێکە لای ئەوان ژێر خاك کراوە، لە هەبوونێکدا کە بمێنن دەرکەوتوون، وەکو ئامرازێك کە هەندێك رەگەز لەخراپکردن زیاتر بەولاوە گوزارشت لەهیچ واتایەکی ترناکەن. دەتواندرێت لەسەروان سیاسەتەکانی توانەوەی بێسنور پێکبهێندرێت. ئەو پاکتاوە جەستەیەی کەلەسەر ئەرمەنیەکان بەڕێوەچووە، دەتوانن لەسەر بنەمای کلتوریش لەسەر کوردان بەڕێوەببەن. جێگای باسە، نەوەێکە کە بەهیچ شێوەێك لە رێبەرەکانی تورکیا ناچێت کە لەهەموو قۆناخە مەترسیدارەکانی مێژوودا لەگەڵ رێبەرەکانی کورد ستراتیژی هاوبەشیان پێشخستووە. کۆمار ئەم نەوەیەی بەردەوام گەورەکرد. نکۆڵیکردن لەکورد وەکو یاسایەك لە ئاسنی بێدەنگ ی مرۆڤایەتی، کاریگەریەکانی دروست کردبوو. لەسەر بنەمای وازهێنان لەکوردایەتی هیچ ئاستێکی تر کە پێیبگەن نەمابوو. بەتەنها لەسەر ئەو بنەمایە دەیانتوانی لە ناو هەموو قۆرخکاریەکانی مۆدێرینیتەدا شوێن بگرن.
تاکو دەرکەوتنی"PKK"، لەبەرامبەر ئەو نکۆڵیکردن و لەناوبردنە کلتوریە، بەدەنگێکی زۆر لاواز نارەزایەتی پیشاندەدرا، "PKK"بەردەوام وەکو هەڕەشێکی ترسێنەر دەبینرا. پێویست بوو نەبووایە، بەڵام بوو. بەڵام ئەم چارەکە سەدەیە کە بە وشەی"نائاسایی"و "مەترسیدار" بەناو بکرێت، لە ئاستێکی پێویستدا سەلمێنراوە ئەو رێگایی لەناویدان تەنها لەبەرامبەر مرۆڤایەتی تاوان نییە، رێگاێکە لەلایەنی مادی و مەعنەوی لە ئاستێکی بێسنوردا لەدەستیداوەو خراپیکردووە. ئەو رێگایە سەرکەوتنی نابێت. لە راستیدا کۆمار لەسەر بنەمای سازشکردنی رەگەزەکانی دیموکراتی تەندروست دامەزراوە. کورد لە رەگەزەکانی دامەزراندنی ئەو سازشکردنە بوو. پرۆژەی مۆدێرینیتەی قۆرخکار کە بەدەستی دەوڵەت بەڕێوەدەچوو، بەبڕیاربوو کە هاوپەیمانەکانی تری وەکو سۆسیالیست و ئومەتپارێزە ئیسلامیەکان لەناو سیستەمدا پاك بکەنەوە. بەدواداچوونی نەتەوەی یەك شێوەی، لە ئاستی هاربووندا لێکۆلینەوەی دەربارە دەکراو، دەخوازرا بەڕێوەبچێت.

پێچەوانەی بانگێشەی بۆ دەکرێت، ئەندازیاری ئەو پرۆژەیە مستەفا کەمال نییە، بەڵکو کادیرە ئیتیحادگەراکانن. وەك چۆن عەبدولحەمید بەکارهێنان، بەهەمان ئەو تاکتیکانە ویستیان م.کەمالیش بەکاربێنن. بەدواداچوونی پلانی لەناوبردنی کوردان لەو کادیرانەدا، بۆ دەستنیشانکردنی راستی گرنگە. هاوپەیمانیەتی سێوی سوور کە هێشتاش بەرەی نەتەوەگەرا ـ مللیگەرا بەڕێوەدەبات، ناوەرۆکێکی فاشیستانەی هەیە، وەکو دژە تێزی هاوپەیمانیەتی دیموکراتیە ئەوەی لەکاتی دامەزراندنی کۆماردا پێشخرا. کۆمیتاگەر و کودەتاچیەکانی شێوازە سەرەکیەکانی لەناو دەوڵەتدابوون. لەناو ئەمریکاو پێش ئەوەش لە ناو ئیمپراتوریەتی بەریتانیدا پشتیوانی باشیان دۆزیبووەوە. لە"60" ساڵی دوایدا پشت بەستن بە گلادیۆی ناتۆ و کۆمەڵگایان لەخۆیندا گەوزاند. بەشێوەیەکی سیمبۆلیکیش بێت، دادگایکردنی ئەرگەنەکۆن لەو هەولانەیاندا کە دەیانەوێت لەناو دەوڵەتدا بینە دەوڵەت، گورزێکی گەورەیان بەرکەوت. ئەو رەوشە لە پاکتاوکردنی ئاغایەتی یەنیچەری"ئەوە نوێکان"دەچوو ئەوانەی کاتی سوڵتان مەحمود. یەنیچەریەکان لەدەرەوەی بەردەوام رووخاندنی پادشایەتی و لەسێدارەدانی سەدرولئەزەمەکان بەولاتر هیچ سوودی تریان نەبوو، لەساڵی"1826"دا رووبەڕووی پاکتاوکردنێکی خوێناوی هاتن و لەناوچوون. بەو شێوەیە توانرا رێگا لەبەردەم تەنزیمات و مەشروتیەتدا"دوو پرۆسەی چاکسازین لە کۆتای ئیمپراتوریەتی عوسمانی " بکرێتەوە.

"یەنیچەریە ئیتیحادگەراکانی مۆدەرێن" بەلای کەمەوە خاوەن رابردوویێکی سەد ساڵەن، تەنها ئیمپراتوریەتی عوسمانی بەرەو رووخان نەبردن، کۆماری تورکیا کە خاون رابوونێکی دیموکراتی هەبوو، لەماوەیەکی کەمدا وەریانچەرخاندە دەسەڵاتداریەتیەکی دەستیۆتیك. لەجیاتی پارێزگاری ئیمپریالیزمی ئەلمانیا، هزر و پێکهاتەی کە پشتدەبەستنە پارێزگاری ئیمپریالیزمی بەریتانیا و ئەمریکا، وەکو نەتەوەگەرا و مللیگەرا، ئەمجارەش بەشەڕی لەناو دەوڵەتدا بەناوی ئەرگەنەکۆن کە بە گەلەکۆمەو ئاژاوەگێری گەورەیان بەڕێوەدەبرد، نەیان توانی بەسەرکەوتووی دەربکەون.

هۆکارەکەشی ئاشکرایە؛ پشتیوانە سەرەکیەکەیان ئەمریکا وازی لە پشتگیری ئەوان هێنابوو. گەڕانیان لە پشتیوانێك لە رووسیا، چین و ئێران، گەمەی ئەوراسیاچیەکەیان جەماوەرێکی ئەو تۆی بۆ دروست نەبوو. شانۆگەریەکەیان بەناوی کەمالیزمیش لە جێبەجێکردنێکی لە ئاستی کاریکارتێردابوو. هەرچەندە ئەو هێزەشیان نەبێت بەرگریش بکات، پێویستە وەکو هزری پێکهاتەی بیرۆکراتیك، باو و نوێنەرە سیاسیەکانیان بچوك نەبینێت. هەرچەندە نەتوانن لەناو دەوڵەتدا سەرلەنوێ هەژمونگەرایی خۆیان دروستیش بکەنەوە، دەتوانن کرانەوە دیموکراتیەکانی تورکیا لە رێ لابدەن و ناوەرۆکی بەتاڵ بکەن، لە رێگای چارەسەری دەربخەن و پووچەڵی بکەنەوە. لەوانەیە ئەزمون و توانایان بەشی ئەوە بکا.

گۆڕانکاریەکانی کە لە رۆژهەڵاتی ناوین و تورکیا روودەدەن، ئەو قەیران و کێشانەی کە رێگایان لەبەردەم کراوەیە، تەنها بەهەنگاو هاویشتنی دیموکراتی فرەوان دەتوانرێت چارەسەربکرێت. لەم بابەتەدا هزرو پێکهاتەی تورکیا خاوەن چانسی بوون بە مۆدێلە. وەکو ئەو مەرجانەی رێگایان لەبەردەم لە دایکبوونی کۆمار کردۆتەوە، ئەمجارەش بۆ وەرچەرخانی دیموکراتی کۆمار و کرانەوەی دیموکراتی جێگای باسە. خۆ دووبارەکردنەوەی مێژوو، بەڵام بەشێوەیەکی نوێ دەستنیشان دەکات. دەتوانین بۆ کوردانیش ئاماژە بەهەمان رەوش بکەین. یەك لەو رۆڵانەی لە هەموو هاوپەیمانیە مێژوویەکانی لە ئەنادۆڵ ـ میزۆپۆتامیا بینیوە، لەبەرامبەر بینینی رۆڵێکی تریشە. ئەوانیش ئیتر کوردی رابردوو نینە. خۆیان نوێکردۆتەوەو رێکخراون و چالاکن. کۆنەپەرستایەتی ناوخۆ، مەحافازەکار و پیلانگێرەکان لە هەردوو گۆڕەپانەکەدان لەوانەیە بیانەوێت رۆڵە مێژوویەکەیان بەردەوام بکەن.

هێزی هەژمونگەرایی جیهانی ئەمریکا، دەزانێت کە بەگلادیۆی ناتۆ ناتوانێت سەرکەوتووبێت. دوای ئەوەی سۆڤیەت رووخا واتای گلادیۆ نەما. لە ئەنجامی هەوڵە زۆرەکانی دەسەڵاتدارانی تورکیا، بۆ هەبوونی گلادیۆ لە تورکیا ئینجا تاکو تشرینی دووەمی "2007" رازیکران. لە راستیدا "25" "PKK" ساڵی دوای بەشەڕی گلادیۆی تورك کە لەژێر چەتری ناتۆدابوو تێپەڕاند. ئاستی مەترسیداری ئەو کارە، تازە بەتازە تێدەگەین کە بەناو کارەساتێکی دووەمین لەشێوەی ئەوەی ئەرمەنیەکان تێدەپەڕین. بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا، ئیسرائیل و یەکێتی ئەوروپا سەبارەت بە رۆژهەڵاتی ناوین و کوردستان، بە گلادیۆگەریەتی رابردوو لەناو ناکۆکی دابوو. سازشکردنیان لەگەڵ پێکهاتەکانی کۆماری تورکیا و حکومەتەیدا، بەلای کەم لە سەر بنەمای دژایەتی کردنی گلادیۆی بە شێوەی کۆن و تێپەڕاندنی دابوو. لەبەر ئەوەش کۆسپەکانی دەرەوە لەبەرامبەر هەنگاوهاویشتنە دیموکراتیەکانی لە تورکیا کە زۆر بەرچاون، لاواز دەبوو. ئیتر چیتر کودەتاچی و پیلانگێڕ وەکو رابردوو پشتگیریان نەکرێت. بەڵام پێویستە لەبیریش نەکرێت کاتێك پێویستیش بکات بۆ بەکارهێنانی ئەوا ئەو دابونەریتە باوە لای خۆیان بهێڵن. وەك چۆن کۆمار لە رابردوو بەو دابونەریتە باوانە ئاستەنگکرا، دوای دامەزراندنیش بۆ ئەوەی لە پێشکەوتن دوورکەوێت سوود لەو پێکهاتەیە وەرگیردرا، هەمان شیمانە لەبەردەم دیموکراتیشدا هەیە. ئەگەر مێژوو زیاتر وەکو هەوڵە ئازادەکانیەتی، ئێستاش لەبەردەمیدا کۆگایەکی بێڕادەیە، دەتوانرێت هەتا دوای سوودی لێ وەربگیردرێت.

هەنگاوەکانی"KCK" هەنگاوی کوردی نوێن، بۆ هەنگاو هاویشتنی شارستانی دیموکراتی خۆیان ئامادەکردوەو "PKK"ش کە وەرچەرخانی دیموکراتی پێکهێناوە، ئامرازی هەرە گونجاویش شەڕنییە، بەڵکو ئاشتیەکی ئابرۆمەندانەو سیاسەتی دیموکراتیە. ئەو تایبەتمەندیە سەرەکیە، بەواتای پاراستنێکی باشی تورکیای دیموکراتیە. هاوپەیمانیەتی مێژووی نێوان ئەنادۆڵ و میزۆپۆتامیا، لە رۆژی ئەمڕۆشدا وەکو تورکیای دیموکراتی و کوردستانی ئازاد، ئازاری سەرلەنوێبوونە ژیاندەکات. بۆ ئەوەی هەل بۆ تێکدەرەکانی ناوخۆ و دەرەوە نەڕەخسێت، تۆزێك گوێ لە مێژوو بگرین باشە. مێژوو بۆ ئەوانەی دەیانەوێت ببیستن، قیبلە نومای راستیە قەت هەڵە ناکات. پشت بەستن بە کۆمەڵگا و خەڵکی وڵاتی دیموکرات و ئازادیش، بۆ ئەوانەی دەزانن تێکۆشان بکەن، بەردەوام سەرچاوەی هێز و ئیلهامە.

لە رەوشی جێبەجێکردنی" هەنگاونانی دیموکراتی و مۆدێلی چارەسەری کێشەی کورد" کە بۆ راستیەکانی مێژوو و هەلومەرجەی رۆژانەی تورکیا ببێتە وەڵام، ئەوا بەتەنها بۆخۆی بە واتای هێشتا ئازادتر هەڵقوڵانی مێژوو و بەوەش سنوردار نەبێت، ئەوا ببێتە رێگای پێشکەوتنی دیموکراتی و ئازاد و یەکسانی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوینیش. لەبەرامبەر دەستبەسرداگرتن و داگیرکاری رەگەزەکانی مۆدێرینیتەی سەرمایەداری لەسەر کلتوری ناوچەکە، پێشکەوتنی رەگەزەکانی مۆدێرینیتەی دیموکراتی، لەگەڵ راستینەی مێژوویدا، ئەوا بتوانێت هەل و هێزی ببێتە سیستەمێك بەدەست بخات. لەوانەیە جاری یەکەم بێت مێژوو لە نوسینەوەی مێژوویێکی وەکو دەستبەسەرداگرتن و داگیرکاری و هەرجۆرە فەتحکردنێك رزگاری ببێت، ئەوا وەکو مێژووی کۆمەڵگای دیموکراتی و پێکهاتوو لە ژیانی تاکە ئازادەکان بنوسرێتەوە.

**15 ئابی 2009**
**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان**
**ئیمرالی**

[پارتی چارە سە ری دیموکراتی کوردستان](http://www.pcdk.org/kurdi/index.php?sid=9793)

http://www.pcdk.org/kurdi/index.php?sid=9793